# ژیاننامەی پێغەمبەران بۆ منداڵان



ئا/ مەروان فائق



دووەم چاپ
هەولێر 2013

# ژياننامەی
# پێغەمبەران بۆ منداڵان

ئا/ مەڕوان فائق

هەولێر

دووەم چاپ

٢٠١٣


www.forsanelhaq.com
أيوب
آدم
شعيب
إسحاق
هود ولوط
عيسى
زكريا ويحيى
أنبياء
الله
محمد
موسى وهارون
داود وسليمان
صالح
إبراهيم
إسماعيل
نوح
يوسف
يونس
عودة




**سەرجەلەی پێغەمبەران ( شجرة الانبياء )**

# پێشەکی

## (( بەناوی خودای گەورەو میهرەبان ))

سوپاس و ستایش بۆ خودای تاك و تەنها، درוودو سەلام و ڕەحمەت بڕژێت بەسەر گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی پێغەمبەری خودا (درוودی خودای لەسەربێت).

سوپاس بۆ خودا کەسانێکی ئەوها خەم خۆر هەن ئاوڕ لە جگەرگۆشەکانمان دەدەنەوە بۆ ئەوەی شارەزابن بە ژیان و ئاکارو خورەوشتی پەیامبەرانی خوا، جێگای خۆیەتی سوپاسی بەڕێز مامۆستا(مەڕوان فائق)بکەین کە هەستاوە بەم کارە جوانە بۆ منداڵە چاو گەشەکانی کوردستان.

دیارە ژیانی پێغەمبەران هەر چەند لەگەڵیاندا بڕوای وانەی باشتر و جوانتری لێ فێر دەبیت، ئەم کتێبەی بەر دەستیشتان بەرچاو ڕوونیەکی باشە بۆ شارەزابوون لە ژیانی ئەو پێغەمبەرانە، ئومێدەوارم کەسی ئەوها دڵسۆزو خەمخۆر زۆر بێت لە کۆمەڵگاکەماندا بۆ خزمەت کردن بەچینی منداڵان. إنشاء الله.

# ئادەم

( سەلامی خودای لەسەر بێت )

## بە دیهێنانی ئادەم( د .خ ):

منداڵە چاو گەشە جوانەکانی کوردستان، زۆر پێویستی مان بەوە هەیە بە زمانی شیرینی کوردی خۆمان، ژیان نامەو بەسەرهاتی ئەو پێغەمبەرانە شارەزابین ، کە خودای پەروەردگار ناردوونی تا  خوا پەرستی مان فێر بکەن، و ڕێگەی بەهەشتمان نیشان بدەن.

## یەکەم پێغەمبەر خودای گەورە پەیامی بۆ نارد...

ئادەم بوو(سەلامی خودای لەسەر بێت)

جا لەگەڵمابن بۆ ئەوەی شارەزابن لە ژیانی .

خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت:

(وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ [البقرة : ٣٠] )

واتە: خودای پەروەردگار بەفریشتەکانی فەرمووی: بە ڕاستی من دەمەوێت لە زەویدا جێنشین دابنێم بۆ ئاوەدانی و دین داری، فریشتەکان وتیان:

ئایا کەسێکی تیادا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تێدا بچێنێت و خوێن ڕێژی تیادا ئەنجام بدات؟ لە کاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەکەین وە قەدرو ڕێزی تۆ چاك دەزانین وە بە دوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین،

لە وەڵامیاندا خودای گەورە فەرمووی:

بێ گومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

کەواتە بۆمان دەرکەوت پێش ئەوەی ئادەم دروست بکرێ، دروست کراوی تری خودای گەورەی لەسەر زەویدا هەبووە، کە هەر خەریکی خراپەکاری بوون، بۆیە فریشتەکان پێیان باش نەبووە.

بەڵام خودای گەورە زۆر لەوان زاناتربوو، فەرمانی کرد بەفریشتەکان بچن بۆ سەر زەوی لە خۆڵی جۆراو جۆر مشتێ خۆڵم بۆ بێنن،

فریشتەکان بە دەم فەرمانەکەوە چوون خۆڵەکەیان بۆ هێنا.

خودای پەروەردگار سەرەتا خۆڵەکەی کرد بە قوڕێکی پتەو، پاشان دەستی کرد بە دروست کردنی ئەندامەکانی لاشەی ئادەم.

بەبێ هیچ کەموو کوڕیەك لاشەیەکی جوان و ڕێك و پێکی بۆ دروست کرد.

## فێرکردنی ( ئادەم ) :

کەسێك بکرێت بەجێنشین، دەبێت زانست و زانیاری هەبێ بەو کارانەی کە پێویستە.

هەروەها ئادەم بۆ ئەوەی شایستە بێ بۆ جێنشینی خودای پەروەردگار لەسەر زەویدا..

دەبێت زانستێکی هەبێ بۆ هەڵ سوڕاندنی کارەکانی.

بۆ ئەم مەبەستە خودای پەروەردگار ئادەمی فێری هەموو ناوەکان کرد کە لەدەوروبەریدا هەبووە.

کاتێك کە ئەم زانستەی خۆی بە فەرمانی خودای گەورە ئاشکرا کرد بۆ فریشتەکان

هەموو فریشتەکان داوای لێ خۆشبوونیان کرد لای خودای گەورەوە وتیان: ئەی خودای گەورە بەڕاستی ئەوەی کە تۆ دەیزانی ئێمە نایزانین.

## کڕنوش بردنی فریشتەکان بۆ ئادەم:

ئادەم بە ناو بەهەشتدا دەگەڕاو سەیری نازو نیعمەتەکانی خودای گەورەی دەکرد.

فریشتەکانیش سەریان سوڕدەماو دەیان وت چۆن خودای گەورە لە خۆڵ ئەم کەسە جوان و ڕێك و پێکەی دروست کردووە، و گیانی بەبەریدا کردووە.

لەو کاتەدا ئیبلیسیش بە لاشەی ئادەمدا دەیڕوانیو بیری لێ دەکردەوە.

خودای پەروەردگار هەموو فریشتەکانی تاقی کردەوە، بەچی؟ بەوەی فەرمایندا و فەرمووی: ئەی فریشتەکان کڕنۆش بەرن بۆ ئادەم.

هەموو فریشتەکان فەرمانی خودای گەورەیان جێ بەجێ کردو لە قسەی دەرنەچوون، کڕنۆشیان بۆ (ئادەم) برد.

بەڵام یەك دانەیان خۆی بە گەورەزانی کڕنۆشی بۆ نەبرد، ئەویش ئیبلیس بوو، واتە: شەیتان.

خودای پەروەردگار فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی بووە هۆی ئەوەی کڕنۆش نەبەی بۆ ئادەم، فەرمانی من بشکێنی .ئیبلیس وتی: چۆن کڕنۆش دەبەم بۆ ئادەم لە کاتێکدا من لەو گەورەترم، منت لە ئاگر دروست کردووە، بەڵام ئادەمت لە خۆڵ دروست کردووە.

لەو کاتەوە خودای پەروەردگار بۆ هەتا هەتایە شەیتانی لە ڕەحمی خۆی دەرکرد.

## * دروست بوونی( حەوا ):

ئادەم بە ناو بەهەشتدا دەگەڕاو سەیری میوەو درەختە جوانەکانی دەکرد، کەمێك ماندوو بوو ویستی دانیشێت و کەمێك بحەسێتەوە،

بەڵام لەوکاتەدا خەوی لێ کەوت، کە خەبەری بوویەوە بینی وا لە تەنیشتیەوە کەسێك وەستاوە.

پرسی لێی تۆ کێیت، چی دەکەیت لێرە؟

ئەویش وتی: من نیوەی تۆم ئەی ئادەم، خودای گەورە دروستی کردووم بۆ ئەوەی پێکەوە ژیانێکی خۆش و بەختەوەرانە بەرینە سەر ، ئادەم لەبەر ئەوە سوپاسی خودای گەورەی کرد.

## دابەزینیان لە بەهەشت:-

خودای گەورە ئادەم و حەوای ئاگادار کردبویەوە لە دوژمنایەتی شەیتان، پێی ڕاگەیاندبوون بەهیچ شێوازێ بە دوای فرتوفێڵەکانی نەکەون.

بۆ ماوەیەکی زۆر لەناو بەهەشتدا پێکەوە ژیانیان بردەسەرو ڕێیان لێ نەگیرابوو بە ئارەزووی خۆیان کام میوەیان بویستایە دەیان خوارد.

بەڵام خودای گەورە پێی ڕاگەیاندبوون بەروبوومی درەختێ هەیە نابێ بە هیچ شێوازێ لێی نزیك ببنەوە.

شەیتانیش ئەمەی بە هەلێکی زۆر باش زانی و ڕۆیشت بۆ لای ئادەم و حەوا، وەسوەسەو خەیاڵی بۆ دروست کردنو پێی وتن: ئەگەر لەبەری ئەو درەختە نەخۆن لەم بە هەشتە خۆشەدا نامێننەوە و دەمرن.

وای لێ کردن ئارەزوویان بچێتە سەر، تا وایان لێ هات لێیان خوارد.

لەو کاتەدا زانییان فەرمانی خوایان شکاندووە نەیان زانی چی بکەن، پۆشاکیان لەبەردا نەما بە پەلە دەستیان دەبرد بۆ گەڵای دارەکان خۆیان پێ دادەپۆشت.

خودای گەورە بانگی کردن فەرمووی: ئایا من نەموت نزیکی ئەو درەختە نەبنەوەو لەبەروبوومەکەی نەخۆن.

وتیان ئەی خودای گەورە لە بیرمان چوو لێمان خۆشبە، خودای گەورەش لێیان خۆش بوو، بەڵام هەر دووکیانی نارده سەر زەوی، شەیتانیشی دەرکرد بۆ لای ئەوان.

## * ژیانی ئادەم و حەوا لەسەر زەوی:

پاش ئەوەی خودای گەورە دایبەزاندنە سەر زەوی بە هۆی ئەو تاوانەی کە کردیان لەبەهەشتدا.

بە ناو زەویدا دەگەڕان بۆ ئەوەی شوێنێکی گونجاو پەیدا بکەن ژیانی تێدا بەسەر بەرن.

پاش ئەوەی نیشتەجێ بوون، ئینجا خودای پەروەردگار منداڵی پێ بەخشین.

تا وای لێ هات منداڵیان زۆر بوو و سەر زەوییان ئاوەدان کردووە، شەیتان هەمیشە خەریك بوو بۆ لە خشتە بردنی منداڵەکانی، یەکێ لەو منداڵانەی کە تاوانێکی گەورەی پێ کرد (قابیل) بوو کە هەستا بە کوشتنی (هابیلی) برای.

ئادەم لە دوژمنایەتی شەیتان وانەیەکی گەورە فێربوو، ئەو پەیامەی خودای گەورە بۆ یناردبوو بەمنداڵەکانی راگەیاندو ئاگاداری کردنەوە لە دوژمنایەتی و سەرسەختی شەیتان، هەموو کات پێی دەفەرموون ئاگاتان لە فرِوفێڵەکانی بێت.

## مردنی ئادەم ( سەلامی خودای لەسەر بێت ):

پاش ئەوەی نەوەی ئادەم لەسەر زەویدا زۆر بوو، زەوی بە شێوازێکی جوان ئاوەدان بوویەوە،ئادەم کاتی ئەوەی هاتبوو بگەڕێتەوە بۆ لای خودای گەورە.

منداڵەکانی کۆکردەوەو دوو وەسیەتی بۆ کردن.

١ـ پێی فەرموون: خودای تاك و تەنها بپەرستن و هەرگیز هاوەڵ و شەریکی بۆ بڕیار مەدەن.

٢ـ ئاگاداری کردنەوە لە فێڵ و دوژمنایەتی شەیتان.

لە پاش ئەم وەسیەتانە فریشتە گیانی کێشاو گەڕایەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە.

# ﴿نوح﴾

(سەلامی خودای لەسەر بێت)

خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت:

﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحاً إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنِّيَ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾[الأعراف : ٥٩].

واتە: سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە نوحمان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەومەکەی، جا ئەویش پێی وتن، ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونکە جگە لەو خوایە خوایەکی ترتان نییە، بەڕاستی من دەترسم لە ڕۆژێکی گەورەدا تووشی بەڵاو سزایەکی زۆر سەخت ببن.

منداڵە خۆشەویستەکان وەرن پێکەوە گەشتێك بکەین بە ژیانی پێغەمبەر نوحدا.

ناوی تەواوی {(نوح)ی کوڕی (لامك)ی کوڕی (متوشلخ)ی کوڕی (ئیدریس)ە}

دوای ئەوەی کە ئادەم و ئیدریس وەفاتیان کرد، کارێکی زۆر ناشیاو لە ناو خەڵکیدا ڕوویدا، ئەویش بت پەرستی بوو، خودای پەروەردگار نوحی کرد بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە.

## چۆن بت پەرستی ڕوویدا :

پیاو چاکێك بە ناوی (ود)هەبوو لەو سەردەمەدا خەڵکی زۆریان خۆش دەویست زۆر ڕێزیان لێ دەگرت.

بەڵام ئەجەلی هات و مرد، لەناو یاندا نەما.

خەڵکەکە بە مردنی ئەم پیاوە زۆر نیگەران بوون و نەیان دەزانی لە تاو خەفەتی چی بکەن .

شەیتان ئەمەی بەهەل زانی، خۆی خستە سەر شێوازی پیاوێك و ڕۆیشتە ناویانەوە .

پێی وتن: ئایا دەتانەوێت پەیکەرێکتان لەسەر شێوازی (ود)بۆ دروست بکەم تا هەمیشە لەبەر چاوتان بێت و کەم تر نیگەران بن.

خەڵکەکە ئەمەیان بیست خێراوتیان: ئەگەر تۆ ئەو کارەمان بۆ ئەنجام بدەیت زۆر سوپاست دەکەین.

شەیتان هەستا بە دروست کردنی پەیکەرەکە، وەکو خۆی بۆی دروست کردن.

بەڵام کەبینی خەڵکەکە زۆرن فریاناکەون تەماشای بکەن، دووبارە پێی وتن: ئەگەر دەتانەوێت بۆ هەر یەکێکتان دانەیەك دروست دەکەم بۆ ئەوەی لەماڵەوە بە ئاسانی تەماشای بکەن.

بەم شێوازە هەریەکەیان پەیکەری بۆ دروست کراو بردیانەوە ماڵی.

خەڵکەکە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەم پەیکەرەیان لا خۆشەویست تر دەبوو، تا وای لێ هات دەستیان کرد بە پەرستنی و خوایان لە بیر چۆوە.

فێری پەیکەر تاشین بوون، هەر پیاوباشێکیان لێ بمردایە پەیکەرێکیان بۆ دروست دەکرد.

لەوانەش کە دروستیان کردبوو ناوەکانیان بریتی بوو لە {ود و سواع و یەغوث و یەعوق و نەسر}

بەم شێوازە شەریك و هاوەڵیان بۆ خودای گەورە بڕیاردا.

## * هەڵبژاردنی نوح لە ناویاندا :

کە ئەم هۆزە ئەوها دەستیاندا بووە بت پەرستی، بەڵام پیاوێکی دارتاشیان تێدابوو بە ناوی (نوح) هەرگیز بەلای بتەکاندا نە دەڕۆشت و بە هیچ شێوازێ نەیدەپەرستن.

خودای پەروەردگاریش ئەم پیاوەی هەڵبژارد لە ناویانداو کردی بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە.

خودای پەروەردگار لە قورئاندا بە (عبداشکورا)ناوی بردووە چونکە هەمیشە سوپاسی خودای گەورەی دەکرد، هەرنیعمەتێکی بینیبا بە موڵکی خودای دەزانیو بەرامبەری شوکرا نەبژێر بوو.

## * ئاگادار کردنەوەی قەومەکەی :

هۆزی نوح ئەوەندە ڕووچووبوون لە بت پەرستیدا، زۆر بەلایانەوە ناڕەحەت بوو گەریەکێ بتەکانیان بە درۆبخاتەوە.

خودای پەروەردگاریش فەرمانی بە نوح کرد قەومەکەی ئاگاداربکاتەوە.

نوح هاتە ناویانەوە و دەستی کرد بە ئامۆژگاری و پێی وتن: ئەی هۆزەکەم خودای پەروەردگار منی ڕەوانەکردووە بۆ ئەوەی ئاگادارتان بکەمەوە لەو کارە خراپانەی ئەنجامی دەدەن داواتان لێ دەکەم خودای تاك و تەنها بپەرستن، دووربکەنەوە لەو بتانەی کە هیچ سودو زیانێکی نیە بۆتان.

خەڵکەکە ئەمەیان بیست زۆریان بەلاوە سەخت بوو، دەسەڵات دارەکانیان وتیان: بەڕاستی تۆ لە نێو گومراییەکی ئاشکرا دەبینین.

نوح سەلامی خودای لەسەر بێت وەڵامی دانەوە و فەرمووی ئەی قەومەکەم من هیچ گومڕاییەکم، نیە بەڵکو من پێغەمبەرێکم و لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانە کراوم...

بەردەوام بوو لە ئامۆژگاریان، بۆ ماوەی نۆسەدو پەنجا ساڵ لە ناویان دابوو، بەڵام چەند کەسێکی کەم باوەڕیان پێ هێنا.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پێی پێ دەکەنین و گاڵتەیان پێ دەکردو بە گومڕایان دادەنا بە تایبەتی گەورە پیاوو پیاو ماقوڵانیان!.

پاش ئەوەی نوح لێیان بێ ئومێد بوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لە خودای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی:

پەروەردگارا من بەشەوو بە ڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەم کرد، کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکردن، تەنها ڕاکردنیان نەبێ!

بە ڕاستی من هەموو جارێ کە بانگم دەکردن تا لێیان خۆش ببیت، پەنجەیان دەخستە گوێچکەکانیان تا نەیبیستن، جلەکانیان بەسەر خۆیاندا دەدا تانەم بینن! زۆر گەرم بوون لەسەر بێ باوەڕی و خۆ بەزل زانین و لووت بەرزیی.

پاشان من بە ئاشکرا بانگم کردن، ئینجا بە ڕوونی و بێ پەردە هەموو شتێکم بۆ باسکردن.

هەندێ جاریش بە نهێنی قسەم بۆ دەکردن ، بەردەوام پێم دەوتن: ئێوە داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتێکی لێ خۆش بووە.

ئەم نزایانەی کردو چاوەڕێی وەلامی پەروەردگار بوو .

## * دروست کردنی کەشتیەکە :

پاش ئەوەی نوح پاڕایەوە لە خودای گەورە و سکاڵای حاڵی خۆی و بێ باوەڕی قەومەکەی خستەڕوو.

خودای پەروەردگار فەرمانی پێ کرد کەشتیەکی گەورەو پتەو دروست بکات.

نوح لەگەڵ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنابوو دەستیان کرد بە دروست کردنی کەشتیەکە.

بەڵام زۆری پێ نەچوو هەر جارەی تاقمێك لە هۆزەکەی بەلایاندا تێدەپەرین، گاڵتەیان پێ دەکرد، نوح فەرمووی: ئەگەر ئێستا ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن، ئەوا بە ڕاستی ڕۆژێك دێت ئێمەش گاڵتە بە ئێوە دەکەین.

پاش ماوەیەك نوح کەشتیەکەی تەواو کرد.

خودای گەورە نیگای بۆ نوح کرد خۆی و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە بچنە ناو کەشتیەکەوە .

لە هەرگیانلەبەرێك نێرو مێیەك لەگەڵ خۆیان بەرن.

خەڵکەکە ئەمەیان بینی ئەوەندەی تر پێیان پێکەنین و گاڵتەیان پێ کردن.

## * لافاوەکە :

پاش ئەوەی بە فەرمانی، خودای گەورە چوونە ناو کەشتیەکەوە، خودای پەروەردگار فەرمانی بە ئاسمان و زەوی کرد کە بە ئاوی خۆیان سەر زەوی پڕ بکەن لە ئاو.

لە ئاسمانەوە بارانێکی زۆرباری و زەویش لە هەمرولایەکەوە ئاوی لێ هەڵقوولا، هاتە تا وای لێهات لافاوێکی زۆر ڕوویدا، کەشتیەکە وردە وردە بەرز بوویەوەو کەوتە سەر ئاو، خودای پەروەردگار ڕزگاری کردن.

ئەو کەسانەش کە باوەڕیان نەهێنا هەموویان لەناو ئاوەکەداو خنکان ڕزگاریان نەبوو، یەکێ لەو کەسانە کوڕەکەی نوح بوو، کە تا ئەو کاتە باوەڕی نەهێنا بوو بە باوکی و هەر لەسەر بت پەرستی بەردەوام بوو.

پاش ئەوەی هەموو بێ باوەڕان خنکان و لە ناو چوون و باوەڕداران ڕزگاربوون، خودای گەورە فەرمووی ئەی زەوی: ئاوەکەت با ڕووبچێ بە ناختدا، ئەی ئاسمان: تۆش بابەس بێت و باران مەبارێنە.

وردە وردە ئاوەکە نەماو باوەڕداران لە ناو کەشتیەکەدا لەسەر شاخی جودی وەستانەوە.

زەویش لە پاش لافاوەکە وشك بویەوە و نوح و باوەڕداران لە کەشتیەکە دابەزین و ژیانی خۆیان بردەسەر.

## * خوا پەرستی نوح:

وەك باسمان کرد نوح پێش ڕووداوی لافاوەکە کەسێکی زۆر خوا پەرست بوو، هەمیشە لەسەر نیعمەتەکان سوپاسی خودای دەکرد.

بە هەمان شێوە لە دوای ڕووداوی لافاوەکە بەردەوام یادی خودای دەکرد بەبێ ئەوەی ساتێ بێ ئاگابێت و هەمیشە سوپاسی خودای دەکرد.

## * مردنی نوح:

نوح لە کاتی سەرەمەرگیدا منداڵەکانی بانگ کردو چەند وەسیەتێکی بۆ کردن.

فەرمووی:

١- بزانن جگە لە خوا هیچ خوایەکی تر نیە شیاوی پەرستن بێت.

٢- هەمیشە سوپاسی خودای گەورە بکەن و پاك و بێ هاوتا ڕای بگرن.

٣- خۆتان لە هاوەڵ دانان بۆ خوا بە دوور بگرن.

٤- هەرگیز خۆتان بە گەورە مەزانن.

لە دوای وەسیەتەکانی گیانی لەلایەن فریشتەوە کێشراو گەڕایەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە.

# هـود

**(سەلامی خودای لەسەر بێت)**

**خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرمووێت:**

﴿وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُوداً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ إِنْ أَنتُمْ إِلاَّ مُفْتَرُونَ﴾ [هود : ٥٠]

**واتە: بۆ لای هۆزی عادیش هودمان نارد کە برایان بوو، وتی: ئەی خزمەکانم، خوا بپەرستن و فەرمان بەر داری ئەوبن، هیچ خوایەکی ترتان نییە جگە لەو، ئێوە هیچ ڕاستیەکتان نیە جگە لە درۆ هەڵبەستن.**

**ناوی تەواوی (هودی کوڕی شالخ)ی کوڕی ئەفەخشەدی کوڕی سامی کوڕی نوحە).**

**هود لە ناو هۆزێکدا دەژیا زۆر ئازاو زەبەڵاح و لاشە گەورە و بەهێزبوون، بۆ دروست کردنی خانوەکانیان بەردی وایان بە کاردەهێنا هیچ کەس جگە لەوان توانای هەڵگرتنی ئەو بەردانەی نەبوو.**

## * لە خۆبایی بوونی هۆزەکەی:

**هۆزی عاد لەبەر ئەوەی دەسەڵات و هێزێکیان هەبوو، خۆیان زۆر بە گەورە دادەنا، هەمیشە دەیان وت: ئەو کارانەی ئێمە دەتوانین بیکەین هیچ کەس نیە وەکو ئێمە ئەنجامی بدات.**

**هەر لەبەر ئەمەش بوو گاڵتەیان بە خەڵکی تر دەکرد، سوکایەتیان پێ دەکردن.**

## * ئاگادارکردنەوەی هۆزەکەی:

هۆزی عاد خەریکی بت پەرستی بوون و وازیان لە یەکتا پەرستی هێنابوو.
خودای پەروەردگاریش هودی تێدا هەڵ بژاردن و کردی بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە. هود هاتە ناو یانەوەو وتارێکی بۆ دان.
سەرەتا پێی ڕاگەیاندن ئەم زەویەی کە خودای تاكو تەنها بۆی فەراهەم هێناوین و چەندەها نیعمەتی خۆی ڕژاندووە بەسەرماندا، هەر ئەو خاوەنی بونەوەرە، هەر ئەو هەمووومانی دروست کردووە، دەبێت بەندایەتی تەنها بۆ ئەو ئەنجام بدەین.
پاشان دەستی کرد بەسەر زەنشت کردنی بت پەرستان و بێ باوەڕان پێی وتن:
باشە چۆن عەقڵ و بیرو هۆشتان ڕێگەتان پێ دەدات واز لە خودای پەروەردگار بهێنن لە کاتێکدا هەرچی میهرەبانیە بەرامبەرتان دەکات ڕزق و ڕۆزیتان دەدات.
لەگەڵ ئەوەشدا پەیکەر بە دەستی خۆتان دروست دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ سوودێکی هەبێت دەیکەن بە خودای خۆتان، داوای پێویستیەکانتانی لێ دەکەن.
هود کەمێك وەستاو پاشان پێی وتن:
ئایا ئێستا بڕیار دەدەن خودای تاك و تەنها بپەرستن، واز لە بت پەرستی بهێنن؟
خەڵکەکە بێ تاقەت بوون لە قسەکانی هود، زۆر بەلایانەوە گران بوو واز لەئایینی باو باپیرانیان بهێنن.
پاشان گەورەکەیان وتی: بەڕاستی ئەی هود وا دەبینین تۆ شێت بوویبیتو عەقڵت لە دەست دابێ.
هود زۆر ماندوو بوو بەردەوام ئامۆژگاری دەکردن، بەڵام تەنها چەند کەسێ باوەڕی پێهێنا، باقی خەڵکەکەی تر لەسەر بت پەرستی بەردەوام بوون و وازیان نەدەهێنا .

هود پێی وتن: بەڕاستی ئەی قەومەکەم من بەریم لەو گوناهانەی ئەنجامی دەدەن، چاوەڕێی بن خودای گەورە بڕیاری داوە ئەگەر پاشگەزنەبنەوە بە سزایەکی سەخت لەناوتان ببات.

دوای ئەم هەواڵە زیاتر سووربوون لەسەر بت پەرستی، وتیان: ئێمە هۆزێکی زۆر بە هێز و بەدەسەڵاتین و هەرگیز کەس ناتوانێ زیانمان پێ بگەیەنێ، ئەگەر تۆش ڕاست دەکەی با ئەو سزایەمان بۆ بێت کە باسی دەکەیت ئێمە چاوەڕێین.

## * کۆتـای ژیـانیـان :

پاشی ئەوەی کە هەر باوەڕیان نەهێناو لەسەر بت پەرستی بەردەوام بوون.

خودای پەروەردگار بۆ ماوەی سێ ساڵ بارانی لێ گرتنەوە، خەریك بوو لە برساندا دەمردن، بەرو بووم و دانەوێڵەیان خەریك بوو بە تەواوی نەدەماو بیرو کانیاوەکانیان وشك ببوو.

لە ئەو سێ ساڵە ڕۆژێك خودای گەورە سێ هەوری بۆ ناردن زۆر دڵ خۆش بوون وایان دەزانی بارانیان بۆ دەبارێ، بەڵام نەیان زانی سزای خودای گەورەیەو لەناویان دەبات!.

پێش ئەوەی سزاکەیان بەسەردا بسەپێت. خودای پەروەردگار فەرمانی کرد بە هودو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە شارەکە بەجێ بهێڵن.

کاتێك موسڵمانەکان ڕۆیشتن، خودای گەورە ڕەشەبایەکی توندی بۆ ناردن بەهێزیەکەی بێ ئەندازەبوو.

حەوت شەوو هەشت ڕۆژ هەڵی کردە سەریان، بەردەوام بوو ئەو خەڵکە هەمووی لاڵ و پاڵ ، هەروەك قەدی دار خورمای لە ڕیشە هەڵ کەنراو لێی کەوتبوون.

تا وای لێ هات هەمووی لە ناوچوو یەك کەس ڕزگاری نەبوو .

هوو بڕوادارانیش ڕزگاری کردن، ڕۆیشتن لە شوێنێکی تر نیشتەجێ بوون و ژیانی پڕ خۆشی و کامەرانی خۆیان تێدا بەسەربرد.

# صاڵح

**(سەلامی خودای لەسەر بێت)**

**خودای پەروەردگارمان دەربارەی دەفەرمویت:**

﴿وَإِلَى ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحاً قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُواْ اللّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ﴾[هود : ٦١] )

**واتە: هۆزی ثەمودیش، صاڵحی برایانمان ڕەوانەکرد، وتی: ئەی خزمەکانم گوێڕایەڵی خودای گەورە بکەن جگە لەو خوایە هیچ خوایەکی ترتان نیە، ئەو بەرپای کردوون لە زەویدا و داوای لێ کردوون کە ئاوەدانی بکەنەوە، جاکەوابوو داوای لێ خۆشبوونی لێ بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای و فەرمانەکانی بەجێ بهێنن، چونکە بە ڕاستی پەروەردەگاری من زۆر نزیکە و نزا وەرگرە.**

**خودای پەروەردگار صاڵحی لە ناو هۆزێکدا هەڵبژارد بەناوی هۆزی (ثمود) ئەم هۆزە بە هێزترین هۆزی سەر زەوی بوون.**

**شاخەکانیان هەڵ دەکۆڵی و خانوویان تێدا دروست دەکرد و لەناویدا دەژیان .**

**بەڵام ئەم هێزو دەسەڵاتە وای لێ کردبوون خۆیان بە گەورە دەزانی خەڵکانی تریان دەچەو ساندەوە.**

**لەگەڵ ئەوەشدا وازیان لە خواپەرستی هێنابوو، بە دەستی خۆیان بە بەردی گەورە بتیان دروست دەکردو کڕنۆشیان بۆ دەبردو داوای یارمەتییان لێ دەکرد.**

## (( ئاگادارکردنەوەی هۆزەکە ))

خودای گەورەو میهرەبان زۆر بە بەزەییە لەگەڵ بەندەکانیدا، بە هیچ شێوازێ ئازاریان نادات تا کەسێکیان بۆ نەنێرێ و ئاگاداریان بکاتەوە.

بۆیە صاڵح کەسێکی زۆر بەرەوشت و میهرەبان بوو لەناویاندا، خودای گەورەش هەڵی بژاردو کردی بە پێغەمبەر بۆ ئەوەی بە ئاگایان بهێنێتەوە.

ڕۆژێك لە ڕۆژرەکانی ساڵ لە ئاهەنگێکدا گەورەپیاوانی (ثە مود) لە یەکێ لە یانەکانیاندا کۆببوونەوە خەریکی ڕابواردن و عارەق خواردن بوون.

صاڵح ئەمەی بە هەلێکی زۆر باش زانی ، بۆیە ڕۆیشتە ناویانەوە و قسەی بۆ کردن،

فەرمووی: ئەی خزمەکانم گوێڕایەڵی خودای گەورە بکەن، جگە لەو زاتە شتێکی ترنیە شیاوی پەرستن بێت، هەر ئەو دروستی کردوون و ئەویش ڕزق و ڕۆزیتان پێ دەبەخشێ، لە پاشە رۆژیشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

پێی وتن: وازبهێنن لە چەوساندنەوەی نەدارو هەژارو بە هێز و دەسەلاّتتان مەنازن، چونکە خودای گەورە زۆر لە ئێوە زیاتر خاوەن دەسەلاّتە و بە توانایە.

فەرموویەتی لە کۆتاییدا داواتان لێ دەکەم بگەڕێنەوە بۆلای خودای گەورەو داوای لێ خۆش بوونی لێ بکەن و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن، بە ڕاستی خودای گەورە زۆر لێ خۆشبووەو دوعا وەرگرە.

بەلاّم بەداخەوە ڕێنموونیان وەرنەگرت و وەلاّمی خراپیان دایەوە، وتیان: ئەی صاڵح ، بەڕاستی پێش ئەم باسانە تۆ لەناو ئێمەدا شوێنی هیوامان بوویت ، بۆ ئاوات لێ هاتیە و سەرت لێ شێواوە؟

## * موعجیزەی وشترەکە :

صاڵح بەردەوام پەیامی خودای پێ ڕادەگەیاندن‌و هەمیشە داوای لێ دەکردن وازلە بت پەرستی بهێنن و خودای تاك و تەنها بپەرستن.

گەورە پیاوانی (ثە مود) زانیان صاڵح وازناهێنێ و بەردەوامە .کۆبونەوەیەکیان کردو لە ناوخۆیاندا ڕێك کەوتن صاڵح تاقی بکەنەوە بزانن پێغەمبەرە یان نا.

ڕۆژێك صاڵح قسەی بۆ دەکردن ، پێیان وت: ئەی صاڵح داوای شتێکت لێ دەکەین ئەگەر جێ بەجێت کرد ئەوا ڕاست دەکەی کە پێغەمبەریت ، ئێمەش باوەڕت پێ دەهێنین.

صاڵح فەرمووی: باشە من ڕازیم چیتان دەوێت داوا بکەن، منیش داوا دەکەم لە خودای گەورە بۆتان جێ بەجێ بکات.

گەورەکانیان کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی داوای چی لێ بکەن، وتیان با داوای شتێکی لێ بکەین هەرگیز بۆی جێ بەجێ نەکرێت لە کۆتاییدا وتیان ئەی صاڵح دەمانەوێت لەو بەردە گەورە وشترێکمان بۆ دەربێنی گەورەو سپی و فلان و فیسار سیفەتی تێدابێت.

صاڵح وتی: ئەگەر داوا بکەم لە خودای گەورەو داواکەم بێنێتەدی، ئایا باوەڕ بە خودای گەورە دەهێنن؟

وتیان بێ گومان.

ئینجا صاڵح ڕۆیشت پاڕایەوە لە خودای گەورە تا ئەو کارە ئەنجام بداتو داوای خەڵکەکە بهێنێتە جێ، ئینجا خودای گەورە داواکەی هێنایەجێ و بەردەکە شەقی بردو وشترێکی لێ هاتەدەر وەك ئەو سیفەتانەی کە ئەوان باسیان کردبوو، خەڵکەکە ئەمەیان بینی واقیانوڕماو سەرسام بوون .

یەکسەر بێ دواکەوتن هەندێکیان هەر لەوێدا باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون .

بەلام کۆمەڵێکی سەرلێشێواوی تێدابوو گومڕایی بەسەریاندا زاڵ ببوو وتیان: بەڕاستی ئەی صالح تۆ ساحیرێکی زۆر گەورەی و باوەڕیان نەهێنا!.

صالح پێی وتن: ئەوە ئەو موعجیزەیە کە داواتان کرد، دەبێ بە هیچ شێوازێك ئازاری نەدەن، ئەگەر ئازاری بدەن ئەوە خودای گەورە سزاتان بەسەردا دەبارێنێ.

پێی وتن: ئەو سەرچاوەی کە ئاوی لێ دەبەن و دەخۆنەوە دەبێ بەشی بکەن لە نێوان خۆتان و وشترەکەدا ڕۆژێ بۆ ئێوە و ڕۆژێ بۆ ئەوە، وەك باس دەکەن ئەو وشترە شیری هەموو خەڵکەکەی داوە.

## * پیلان دانان بۆ کوشتنی وشترەکە :

کاتی نۆرە ئاوەکە لەناویاندا درێژەی کێشا، ئیتر زاناکانیان کۆبوونەوە بڕیاریان دا وشترەکە بکوژن، تاکو لە دەستی بحەسێنەوە و ئاوەکەش تەنها بۆ خۆیان بێت .

ئەومیان کە کوشتنی وشترەکەی گرتە ئەستۆی خۆی(قەداری کوڕی سالف)ی سەرکردەیان بوو، کە پیاوێکی سوری شین باوی بەڵەك بوو بۆیە ئەم کارەی گرتە ئەستۆی خۆی.

چونکە لە ناو(ثە مود)دا دوو ژن هەبوون ناویان (صدوق)و(عنیزە)بوو، یەکەمیان ئافرەتێکی زۆر جوان و لێهاتوو بوو، کاتێك مێردەکەی باوەڕی هێنا لە مێردەکەی جیابویەوە و بە (مصرع)ی، ئامۆزای خۆی وت: خۆمت پێشکەش دەکەم گەر وشترەکە بکوژیت.

دووەمیشیان ژنی (زۆاب)ی کوڕی(عەمر)بوو چوار کچی جوانی هەبوو، لەلایەن زۆر کەسەوە داوادەکران بەڵام نەیدەدان بە شوو.

بەقەداری وت ئەگەر وشترەکە بکوژی کامیانت بوێ دەتدەمێ.

بەم جۆرە ئەم دوولاوە خۆیان تەرخان کرد بۆ کوشتنی وشترەکە، پاشان حەوت کەسی تر هاتنە لایان و بوون بە نۆکەسی تەواو.

ئەم نۆکەسە بڵاوەیان کرد چاویان دەگێرا بۆ دۆزینەوەی وشترەکە. کە دەرکەوت (مصرع)تیرێکی تێ گرت ئێسکی قاچی پێکا.

(قەداری کوڕی سالف) گوڕو تینی دایە بەر خۆی و بە شمشێرەکەی قوڕگی هەڵ دڕی، وشترەکە کەوت بەزەویداو دەنگێکی گەورەی ترسناکی لێ هات، دووبارە پەلاماریدا و سەری لێ کردەوە.

## * لە ناوچوونی پیلان گێڕان:

صاڵح کە ئەم هەواڵەی پێ گەیشت زۆر نیگەران بوو، بۆیە ڕۆیشتە ناویانەوە و پێی وتن: مادەم سەرپێچی فەرمانی خودای گەورەتان کرد، ئەوا خودای گەورە بڕیاری داوە سزایەکتان بدات هیچ کامتان دەربازی نەبێ.

پێی وتن: بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بمێننەوە، لە ماڵەکانتاندا خەریکی ڕابواردن بن.

تاوان باران کە ئەمەیان بیست بڕیاریاندا، بڕۆن صاڵحیش لە ماڵەکەی خۆیدا بکوژن.

بەرێ کەوتن بەرەو ماڵی صاڵح بەڵام خودای پەروەردگار پاراستی ئەو کەسانەشی بەردباران کرد کە هەستابوون بە ئەنجام دانی ئەو کارە.

پاشان تاوان باران چاوەڕێی سزای خوابوون، لای صاڵح بەگاڵتە کردنەوە دەیان وت: ئەو سزایە کەی دێت بۆ دیارنیە. لە ڕۆژی یەکەمدا ڕوخساریان زەرد هەڵ گەڕا کە گەیشتنە ئێوارە وتیان بە ڕاستی بە لێنەکانی صاڵح هەمووی درۆیە، لە ڕۆژی دووەمدا هەموویان ڕوخساریان سوور هەڵگەڕاو کە ئێوارەیان لێ بوویەوە دیسان دەستیان کردەوە بە گاڵتە کردن، لەڕۆژی سێیەمدا ڕوخساریان ڕەش هەڵ گەڕا، هەرکە ئێوارە هات بە هەمان شێوازی ڕۆژانی دی، گوتیان ئەوە ماوەکە تێ پەڕی کەچی هیچ ڕووی نەدا.

سەر لە بەیانی ڕۆژی یەك شەممە دانیشتبوون چاوەڕوانی سزاکەیان دەکرد، نەیاندەزانی چۆن و لە کوێوە سزاکەیان بۆ دێت و چییان بەسەر دێت، لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا دەنگێکی زۆر بەهێز و تیژ لە ئاسمانەوە هاتە سەریان زەوی ژێرپێیان کەوتە جووڵە و لە رزین، زەندەقیان چوو، زراویان تەقی، گیانیان دەرچوو، هیچ دەنگێك سەدای نەما، هەموویان بوون بە لاشەی بێ گیان، کەس ڕزگاری نەبوو.

# ﴿لوط﴾

(سەلامی خودای لەسەر بێت)

خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت:

﴿وَإِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ * إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ * فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ﴾﴿الشعراو:١٦١- ١٦٣﴾

واتە: کاتێك لوطی برایان پێی وتن: باشە ئەوە ئێوە لە خوا ناترسن، بەڕاستی دڵ نیابن کە من فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان.

کەوابوو لە خوا بترسن و فەرمان بەرداری من بکەن...

ناوی تەواوی :﴿ لوطی کوڕی هارانی کوڕی ئازەرە﴾ کە دەکاتە برازای ئیبراهیم سەلامی خودایان لەسەربێت.

لوط لەو کەسانەبوو کە هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بە پێغەمبەر ئیبراهیم هێنا.

ئیزنی لە ئیبراهیم خواست تا کۆچ بکات و لەو شارە نەمێنێ.

کۆچی کرد و ڕۆیشت تا گەیشتە شارێ بە ناوی (سە دوم) لەوێ بۆ ماوەیەکی زۆر نیشتەجێ بوو.

## * ئاگاداركردنەوەی هۆزەكەی:

ئەو هۆزەی کە (لوط)ی لێ نیشتەجێ ببوو پیسترین هۆزی سەر زەوی بوون، وەك خودای گەورە دەفەرموێت کارێکی ناشیرینی وایان ئەنجام دەدا، هیچ هۆزێك ئەو کارەی ئەنجام نەداوە.

کارە پیس و قێزەو نەکەشیان ئەوە بوو نێربازیان دەکردو وازیان لە ئافرەت هێنابوو.

بۆیە (لوط) پێی وتن: باشە ئێوە ئەو کارە نابەجێ و تاوان و گوناهە ئەنجام دەدەن؟

لە کاتێکدا ئێوە چاوتان هەیە و دەزانن.

ئایە ڕەوایە کە ئارەزووی خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام بدەن لە جیاتی ژنان؟

نەخێر ئێوە ژیرنین، بەڵکو ئێوە گەلێکن سەرەنجامی ئەم ئیشە خراپە نازانن.

بەڵام هۆزەکەی چاوی خۆیان داخست و ئامۆژگاریان وەرنەگرتو بەردەوام بوون لەسەر ئەنجام دانی تاوانەکەیان.

لوط هەر بەردەوام بوو بە ڕاستی و پاکی لەگەڵیان دەدوا بەڵام ئایا سوودی هەبوو بۆیان ؟

بێگومان نەخێر بەڵکو گەورەکانیان کۆبوونەوە لەسەر ئەوەی، لە شارەکەش وەدەری بنێن، بەڵام بۆیان نەکرا.

لوط منداڵەکانی زۆر داوێن پاك و خواناس بوون، باوەڕیان هێنابوو بە خودای گەورە.

بەڵام تەنها ژنەکەی نەبێت خیانەتی کرد لە (لوط)و باوەڕی پێ نەهێنا.

لەو هۆزەش تاقمێکی کەم نەبێ، باوەڕیان پێ نەهێنا.

## * پاڕانەوەی لە خودای گەورە:

ئەم هۆزە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لەسەر ئەو کارە پیسە بەردەوام بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی تری زۆر خراپیان ئەنجام دەدا ئەویش، ڕێگرتن لە خەڵکی بوو.

کەسێکی غەریبەیان بەرچاو بکەوتایە خێرا ڕێیان پێ دەگرت و چی پێ بوایە لێیان دەسەند.

لوط لەم کارانەیان زۆر بێ تاقەت بوو و هەرچی دەکرد وازیان نە دەهێنا.

لوط ڕۆیشت دەستی کرد بە نوێژ کردن، پاشان کە تەواو بوو دەستی بەرز کردەوە و پاڕایەوە لە خودای گەورە کە سزایەکیان بۆ بنێرێ هیچ کەسێك وەها سزا نەدرابێ.

## * دابەزینی فریشتە:

خودای پەروەردگار نزاکەی لێ وەرگرت و بڕیاری دا هەموویان لە ناو بەرێت.

ئەو سێ فریشتەی کە لە ژیانی ئیبراهیمدا سەلامی خودای لەسەر بێت باس دەکەین، لە وێوە هاتن بۆ ماڵی پێغەمبەر لوط.

لوط نەیزانی فریشتەن بردنیە ماڵەوە و ڕێزێکی زۆری لێ گرتن، بەڵام خێزانەکەی کە ئەوانی بینی چەند جوانن ڕۆیشتە دەرەوە و هەواڵیدا بە خەڵکەکەدا.

کەمێکی پێ نەچوو، هەموو خەڵکی شارەکە کۆبوونەوە هاتن بۆ بەردەرگای (لوط)، داوایان لە لوط کرد وتیان: ئەو گەنجانەمان بدە دەست ، لوط زۆر ترسا هەرچی دەکرد وازیان نەدەهێنا، زۆر نیگەران بوو پێی وتن: ئەو هەموو کچە داوێن پاك و جوانە هەیە، بۆ واز لەمیوانەکانم ناهێنن، تکاتان لێ دەکەم وازبهێنن.

فریشتەکان زانیان هەر وازناهێنن، یەکیان وتی نیگەران مەبە ئەی لوط ئێمە فریشتەی خودای گەورەین و بە هیچ شێوازێ ناتوانن پێت بگەن.

کە لوط ئەمەی بیست زۆر دڵی خۆش بوو زانی ناتوانن زیانیان پێ بگەیێنن.

یەکێ لە فریشتەکان باڵێکی ڕاوەشاند بە ناو یاندا هەموویانی گێژ و بێ هۆش کرد، هەموویان ڕایان کرد و بەجێیان هێشت لە پاشاندا وتیان ئەی لوط فەرمانمان پێیە، پێش ئەوەی ڕۆژببێتەوە خۆت و باوەڕداران ئێرە بەجێ بهێڵن، بە هیچ شێوەیەك لامەکەنەوە.

# * تیاچوونی هۆزی لوط:

لە پاش دەرچوونی باوەڕداران لە (سەدوم) خودای پەروەردگار فەرمانی بە فریشتەکان کرد سزاببارێنن بەسەریاندا و لە ناویان بردن.

فریشتەکان بە فەرمانی خوا شارۆچکەکەیان ژێرەو ژوور کرد، لەو کاتەدا هەموو دەیاناڵاندو دەیان قیژاند لە تاو ئێشو ئازار لە پاشاندا بە قوڕی سور کراو کە وەك بەرد وابوو، چین لەسەر چین بەرد بارانیان کردن. هەموو بەردەکانیش دیاری کراو بوون لێی نوسرابوو بەکێدا دەدا، هاوسەری لوط لە شارەکە ڕایکردبوو، بەلاّم کە گوێی لە دەنگە بەرزەکە بوو لای کردەوە بەلای شارەکەدا، لەو کاتەدا بەردێك بەر تەوقە سەری کەوت و بە کافری مرد.

خودای پەروەردگار بە مەش وازی لێ نەهێنان، دەریای مردووی هێنا بەسەر یانا و هەموویان کەوتنە بنی دەریاکەوە هەتا ئێستاش ئەو دەریایە هەر بەسەریانەوەیە!

باوەڕداران لەگەڵ لوط دارۆیشتن بۆ ناوچەیەکی ترو لەوێ درێژەیان بە ژیان و خواپەرستی ڕاستەقینەی خۆیان.

# ئیبراهیم

**( سەلامی خودای لەسەر بێت )**

**خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموویت:**

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقاً نَّبِيّاً * إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئاً﴾ [مريم : ٤٢]

**واتە: (ئەی محمد) هەروەها لە قورئاندا باسی گۆشەیەك لەبەسەرهاتی ئیبراهیم بۆ ئەو خەڵکە بگێڕەوە، بە ڕاستی ئەو کەسایەتیەکی ڕاستگۆ بوو، لە پێغەمبەرانیش بوو.**

**کاتێك بە باوکی وت: باوکی بەڕێزم، ئەوە تۆ بۆچی شتێك دەپەرستیت کە نە گوێ بیستە، نە کەس بەرچاو ڕۆن و ڕۆشن بیر دەکات، نە هیچ سوودێکت پێ دەگەیەنێت.**

**منداڵە چاوگەشەکان با گەشتێك بکەین بە ناو ژیانی ئیبراهیمدا، بزانین چۆن ژیانی بردووەتەسەر.**

**ناوی: (ئیبراهیم ی کوڕی ئازەری ناحورە)کە دەچێتەوە سەر پێغەمبەر نوح سەلامی خودای لەسەر بێت.**

**لە ناوخێزانێکدا ژیانی بەسەر دەبرد لە ڕووی مادیەوە مامناوەند بوون، لە شوێنێك نیشتەجێ بوون بە ناوی زەوی (کلدانیەکان) کە دەکاتە بابلی کۆن.**

**هەر لە منداڵیەوە خودای پەروەردگار ڕۆشنای باوەڕی خستبووە دڵیەوە، دانایی و زیرەکیەکی باشی پێ بەخشی بوو.**

**بەڵام ئازەری باوکی خەریکی بت دروست کردن بوو، زۆرجار بە شێوازێکی جوان و شیرین لەگەڵ باوکیدا گفتوگۆی دەکرد، پێی دەوت ئەی باوکی شیرینم بۆچی شتێك دەپەرستی کە بەهیچ شێوەیەك سوودی نیە بۆت، بەڵام باوکی گوێی پێ نەدەدا.**

## * بیرکردنەوەی ئیبراهیم:

ئیبراهیم هێشتا منداڵ بوو، دەیزانی ئەو بتانەی هۆزەکەی دەیپەرستن هیچ سوودێکی نیە.

بڕیاری دا بگەڕێت و بیربکاتەوە تا خودای ڕاستەقینە بەدی بکات.

شەوێك ڕۆیشتە دەرەوە سەیری ئاسمانی کرد ئەستێرەیەکی بینی وتی: با وا دابنێین ئەمە پەروەردگارمە، کاتێك ئەستێرەکەی لێ ون بوو وتی: من شتی لەبەر چاوون بووم خۆش ناوێ و نایپەرستم .

ئینجا کاتێك مانگی بینی هەڵهات، وتی: ئاگاداربن وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێك ئەویش ئاوابوو وتی: سوێند بە خوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدابامایە، بێ گومان لە ڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم.

ئینجا کاتێك خۆری بینی هەڵهات، وتی:ئاگاداربن وا دابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمە گەورەتریشە، کاتێك ئەویش ئاوابوو وتی: ئەی خەڵکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەو شتانەی ئێوە کردووتانە بە هاوەڵ و شەریك بۆ پەروەردگار.

بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە.

ڕووم لە هیچ شتێکی تر ناکەم، بەدڵ ئارامی تەواویشەوە دەڵێم کە: هەرگیز من لە ڕیزی هاوبەش پەیدا کاراندا نابم.

## * شکاندنی بتەکان:

ئەو شارەی ئیبراهیمی تێدا دەژیا گەلێك بتی تێدابوو، خەڵکی ڕۆژانە ڕوویان دەکردە پەرستگاکەیان و کڕنۆشیان بۆبتەکان دەبرد.

ئیبراهیم بۆ هەلێ دەگەڕا کەتێیدا بتەکان بشکێنێ.

لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ساڵدا، خەڵکەکە هەمووی بڕیاریاندا بچنە دەرەوەی شار بە نیازی گەشت و گوزارو سەیران.

لەبەرەبەیاندا خەڵکی پۆل پۆل لە شار دەرچوون، کەسی لێ نەما تەنها ئیبراهیم نەبێ. کاتێ بە ئەویشیان وت کە بچێ لەگەڵیان بەڵام خۆی نەخۆش خستو وتی: نەخۆشم.

ئیبراهیم دوا بەدوای ئەوان تەورێکی خستە سەرشانی و بەرەو پەرستگاکەیان کەوتە رێ.

لەوێ بە ناو بتەکاندا دەگەڕاو گاڵتەی پێ دەکردن.پاشان دەستی کردە تەورەکەو بەبتەکاندا هات.هەموویانی شکاند جگە لە گەورەکەیان نەبێ، تەورەکەی خستە سەرشانی گەورەکە و بەجێی هێشتن!.

## * گفتوگۆ ئیبراهیم لەگەل هۆزەکەی:

کە ئێوارە داهات هەموو خەڵکی بەرەو ناو شار گەڕانەوە، بەلای پەرست گاکەیاندا تێپەرین بینیان وا هەموو بتەکانیان شکاوەو پارچە پارچە کراوە.

کە ئەمەیان بینی زۆر بێ تاقەت بوون و توڕەبوون، وتیان بزانن کێ ئەم بتانەی شکاندوە، سزایەکی دەدەین ببێ بە پەندو ئامۆژگاری بۆ خەڵکانی تر.

کەمێك بیریان کردەوە بۆ ئەوەی بزانن کێ ئەم کارەی ئەنجامداوە. لە ئەنجامدا وتیان کەسێك کە هەمیشە گاڵتەی بە بتەکانمان دەکرد ئیبراهیم بوو، تەنها ئەویش لەگەڵمان نەهات بۆ دەرەوەی شار.

ڕۆیشتن ئیبراهیمیان هێنا وتیان:

ئایا تۆ ئاوات لەخواکانمان کردووەو سوکایەتیت پێ کردون؟

ئیبراهیم وتی: لە گەورەی بتەکان بپرسن ئەگەر قسە دەکات؟

بت پەرستەکان وتیان: خۆتۆ باش دەزانی ئەوانە بە هیچ شێوەیەك قسە ناکەن.

ئیبراهیم وتی: کەواتە چۆن بتانێك دەپەرستن نەقسە دەکەن و نە دەبیستن، خۆتان بە دەستی خۆتان دروستتان کردوون، ناشتوانن پارێزگاری لە خۆیان بکەن، تیاچوون بۆ ئێوە، چۆن شتی وادەپەرستن؟.

گەورەی بت پەرستەکان زانی ئیبراهیم لەسەر ڕاستیە، قسەی نەکردو بێ دەنگ بوو.

## * سزادانی ئیبراهیم بە ئاگر:

گەورە پیاوان و بت پەرستان دەستەوسان بوون بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ ئیبراهیمداو نەیان توانی بە هیچ شێوازێ بەرپەرچی بدەنەوە.

بۆیە بڕیاریان دا سزایەکی پڕ ئێش و ئازاری بدەن، کەس ئەوسزایەی نەدرابێ.

خەڵکی ئاگادارکرانەوە پێیان وتن هەرکەس لە ئاستی خۆیەوە چیلکەو دارکۆ بکاتەوە، خەڵکی هەر یەك لەلای خۆیەوە کۆڵێك چیلکە و داری کۆکردەوەو بردیان بۆ شوێنی دیاری کراو .

ئیتر بت پەرستان وتیان: ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن.

ئاگریان کردەوە، بەڵام ئەوەندە ئاگرەکە بەتین بوو نەیان وێرا لە نزیکەوە هەڵی دەنە ناوی!.

مەنجەنیقێکیان هێنا ئیبراهیمیان تێ کردو لە دوورەوە فڕێیان دایە ناوی.

لەوکاتەدا خودای پەروەردگار فەرمووی: ﴿ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْداً وَسَلَاماً عَلَى إِبْرَاهِيمَ ﴾[الأنبياء : ٦٩]

واتە: ئەی ئاگر ساردو سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم.

خەڵکی چاوەڕێیان دەکرد ئاگرەکە دامرکێتەوە و کۆتایی ژیانی ئیبراهیم ببینن و وایان زانی سوتاوەو هیچی نەماوە.

بەڵام خودای گەورە ڕەحمی پێ کردو بە سەلامەتی هاتە دەرەوە، کە خەڵکەکە ئەمەیان بینی واقیان وڕما خەریك بوو شێت ببن، دوای ئەوە ئیتر نەیان توانی هیچ ئازارێ بە ئیبراهیم بگەێنن.

# * کۆچ کردنی ئیبراهیم:

پاش ماوەیەکی زۆر لە گەیاندنی پەیامی خوا لەو شارەدا، خودای پەروەردگار فەرمانی پێ کرد کۆچ بکات.

خۆی و هاجەرە خاتوونی خێزانی بەرەو بیابان بەڕێ کەوتن، ماوەیەکی زۆر ڕێیان بڕی، خودای پەروەردگاریش منداڵێکی پێ بەخشین بە ناوی ئیسماعیل.

پاش ماندووبوونێکی زۆر گەیشتنە شوێنێکی وشك و بێ ئاو هەمووی شاخ و بیابان بوو.

ئیبراهیم هاجەرەو ئیسماعیلی لەوێ داناو بەجێی هێشتن، خاتوو هاجەرە پێی وت: بۆ لەم شوێنە چۆل و بێ ئاوەدا بەجێمان دەهێلی، بەلاّم ئیبراهیم وەلاّمی نەدایەوەو ڕۆیشت: پاشان وتی: ئەگەر خوا فەرمانی پێ کردویت، ئەوا بە فەرمانی خوا ڕازیم، دەزانم ئاگای لێ مانە.

ئیبراهیم سەرێکی لە قاندوو ڕۆیشت، ئیتر هاجەرە خاتوون زانی فەرمانی خوایە بێ دەنگ بوو.

بەلاّم ئاویان لێ بڕابوو نەیدەزانی چی بکات، لەم لا بۆ ئەو لا ڕای دەکرد بەلاّم هیچی دەست نەدەکەوت، خەریك بوو خۆی و ئیسماعیل لە تینوێتیدا دەخنکان، بەلاّم خودای گەورە فریایان کەوت و هاجەرە خاتوون پێیەکی دا بە زەویدا بە فەرمانی خوا ئاوێکی جوانو سازگار هاتە دەرەوە، ئەو ئاوە یە پێی دەڵێن زەم زەم، هەر لەو شوێنە دا نیشتەجێ بوون، وردە وردە خەڵکی بە هۆی ئەو ئاوەوە ڕووی تێ دەکردن و لەوێ نیشتەجێ دەبوون، ئەو شوێنەش بریتیە لە (مەککە)ی ئێستا کە ساڵانە سێ ملیۆن کەس بۆ حەجکردن ڕووی تێ دەکەن.

ئیبراهیم کە بەجێی هێشتن بەرەو فەلەستین کەو تەڕێ و لەوێ نیشتەجێ بوو، ساڵانە سەری لە هاجەرە و ئیسماعیل دەدا.

# ئیسماعیل

**( سەلامی خودای لەسەر بێت )**

**خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی دەفەرموویت:**

(وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِسْمَاعِيلَ إِنَّهُ كَانَ صَادِقَ الْوَعْدِ وَكَانَ رَسُولاً نَّبِيّاً (٥٤)وَكَانَ يَأْمُرُ أَهْلَهُ بِالصَّلَاةِ وَالزَّكَاةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِ مَرْضِيّاً [مريم : ٥٥]

**واتە : ئیسماعیلیش باس بکە لە قورئانـدا، بەڕاستی ئـەو لـە پەیمانەکەیـدا راستگۆبوو، ئەو پێغەمبەر و ڕەوانە کراوی خوابوو.**

**ئیسماعیل هەمیشە و بەردەوام فەرمانی دەدا بە خێزان و خزمانی، نوێژەکانیان بەرێك و پێکی و لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەن و زەکاتیش فەرامۆش نەکـەن، ئـەو لای پـەروەردگاری شایستەی ڕێزو ڕەزامەندی بوو.**

**منداڵـە خۆشەویـستەکانی هـاوڕێم، ئێـستاش وەرن باگەشـتێ بکـەین بـە ژیـانی ئـەم پێغەمبەرەدا، کە هەمووی دەرس و پەندە بۆ ئێمە.**

**ناوی:﴿ئیسماعیل کوڕی پێغەمبەر ئیبراهیمە ﴾سەلامی خوا لەسەر هەر دووکیان بێت.**

**دایکی ناوی ﴿هاجەرە﴾یە.**

**لـە ژیـانی پێغەمبـەر ئیبراهیمـدا باسـی چۆنیەتی لـە دایـك بـوونی و شـوێنی لە دایـك بوونیمان کرد.**

**باسی ئەوەمان کرد کە باوکی چۆن بە جێی هێشتن لە شوێنێکدا کـە هـەمووی بیابـان و شاخ بوو و ئاوەدانی بە هـیچ شـێوەیەك تیادانـەبوو و باسـی هـەڵ قـوڵانی ئـاوی زەم زەمـمان کرد.**

## * سەربڕینی ئیسماعیل .

ئیبراهیم کاتێك لە فەڵەستین جێگیربوو، هەموو ساڵێ جارێك سەردانی هاجەرەو ئیسماعیلی دەکرد، بۆ ئەوەی بزانێ حاڵیان چۆنە.

تەمەنی ئیسماعیل چوار دەساڵی تەاو بوو، منداڵێکی زیرەك و عاقڵ و گوێرایەڵ بوو.

لە یەکێ لە جارەکاندا ئیبراهیم سێ جار لەسەریەك لە خەونیدا ئیسماعیلی کوڕی سەردەبڕێ.

ئیبراهیم زۆر ئیسماعیلی خۆش دەویست، بەڵام خەوی پێغەمبەران فەرمانی خودای گەورەیەو دەبێ جێ بەجێی بکات.

خودای پەروەردگار هەر دووکیانی تاقی کردەوە ئایا لەو تاقی کردنەوە دەردەچن یان نا؟.

ئیبراهیم هاتە لای وتی:

ئەی کوڕی شیرینم بەبێ گومان من لە خەونمدا دەمبینی کە تۆ سەردەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟ ڕات چۆنە؟

ئیسماعیل وتی: بابەگیان هەرفەرمانێکت پێ دراوە جێبەجێی بکە، دەمبینیت ئەگەر خوا حەزبکات، لە ئارام گران دەبم.

ئیبراهیم بە دەمدا خستیە سەر خاك و هەر دووکیان ئامادەی جێبەجێ کردنی فەرمانی خوا بوون.

ویستی دەست بە کارەکە بکات، بەڵام خودای گەورەبە سۆزو میهرەبانی بێ وێنەی خۆی بەزەیی پێیاندا هاتەوەو ڕەحمی پێ کردن، دەنگێك لە ئاسمانەوە بانگی کرد وتی: ئەی ئیبراهیم بە ڕاستی خەونەکەت هێنایە دی.

لەلایەن خواوە بەرانێکی قەڵەو بۆ ڕەوانە کرا، لە بری ئیسماعیل وەکو قوربانی سەری بڕی.

## * ژن هێنانی:

لەو شوێنەی کە لێی نیشتەجێ بوون، پاش دەرکەوتنی ئاوی زەم زەم، خەڵکی لە هەموولایەکەوە ڕووی تێ دەکردن و نیشتەجێ دەبوون.

ئیسماعیلیش کە گەورەبوو کاتی ژن هێنانی هاتبوو ڕۆیشت کچێکی خواست، ماوەیەك پێکەوە ژیان.

ئیبراهیم لەسەردانێکدا هاتەماڵەکەی ئیسماعیل تەنها هاوسەرەکەی لە ماڵ بوو، لێی پرسی: ژیانتان چۆنە، ژنەکەی ئیسماعیل وتی زۆر خراپین کەم دەرامەتین،

ئیبراهیم پێی وت ئەگەر مێردەکەت هاتەوە پێی بلێ سەکۆی بەر دەرگا بگۆڕێ.

کاتێك ئیسماعیل هاتەوە هەواڵەکەی پێدا زانی باوکییەتی، بۆیە وتی ئەوە فەرمانی پێ کردووم تۆ تەلاق بدەم، بۆیە تەلاقی داو ڕۆیشت کچێکی تری خواست.

بۆ ساڵی داهاتوو ئیبراهیم بە هەمان شێوە سەردانی کردنەوە ئیسماعیل لە ماڵ نەبوو پرسی لە هاوسەرەکەی ژیانتان چۆنە وتی: زۆر باشین، ژیانمان زۆر خۆشە.

ئیبراهیم پێی وت: گەر ئیسماعیل هاتەوە پێی بلێسەکۆی بەر دەرگا قایم بکات و نەی گۆڕێ.

کاتێك گەڕایەوە هەواڵەکەی پێدا وتی ئەوە باوکم بوو، فەرمانی پێکردووم تۆلای خۆم بهێلم تەلاقت نەدەم.

لەناو ئەم هۆزەدا بەردەوام پەیامەکانی خودای پێ ڕادەگەیاندن. هەمیشە فەرمانی پێ دەکردن بە نوێژکردن و زەکات دان.

## * دروست کردنی کەعبە :

خودای پەروەردگار فەرمانی بە ئیبراهیم کرد ماڵێك دروست بکات، بۆ ئەوەی ببێت بە جێی خواپەرستی خەڵکی.

ئیبراهیم لەگەڵ ئیسماعیلدا دەستیان بە دروست کردنی کەعبە کرد، بە شێوازێکی زۆر بەرزو جوان و رێك وپێك دروستیان کرد.

کاتێك تەواوبوون لە دروستکردنی دەستیان بەرزکردەوە و داوایان لە خودای پەروەردگار کرد لێیان قبووڵ بکات.

ئیبراهیم لە خوا پاڕایەوە خەڵکی واڵێ بکات هەمیشە حەز بە سەردانی کەعبە بکەن.

خودای پەروەردگاریش پاڕانەوەکەی قبووڵ کرد، لەو سەردەمەوە هەتائێستاش خەڵکو بە ئاواتەوەن جارێك سەردانی ئەو ماڵە بکەن.

ئیسماعیل پاش تەمەنێکی زۆر لە خواپەرستی و ڕاستگۆیی و ئەنجام دانی پەیامی گەڕایەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە.

# ﴿ئیسحاق﴾

( سەلامی خودای لەسەر بێت )

خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێت:

﴿وَبَشَّرْنَاهُ بِإِسْحَاقَ نَبِيًّا مِّنَ الصَّالِحِينَ * وَبَارَكْنَا عَلَيْهِ وَعَلَى إِسْحَاقَ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحْسِنٌ وَظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ مُبِينٌ﴾ [الصافات : ١١٣]

واتە:مژدەی هاتنە دونیای ـ ئیسحاق ـ یشمان بە ئیبراهیم بەخشی کە ئەویش پێغەمبەرێکە لە چاکان.

خێرو بەرەکەتمان ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و ئیسحاقدا و لە نەوەی هەردووکیان، واتە (ئیسحاق و ئیسماعیل) چاکان و پاکان، هەروەها ئەو کەسانەش پەیدادەبن بە ڕوونی ستەم لە خۆیان دەکەن.

## * سەرەتای لە دایك بوونی:

ئیبراهیم سەلامی خودای لەسەر بێت تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی سەد ساڵی و سارەی خێزانیشی نزیکی نەوەد ساڵ، لە فەلەستین نیشتەجێ بوون و ژیانیان بەسەر دەبرد.

ڕۆژێکیان سێ فریشتە خۆیان خستبووە سەر شێوازی سێ گەنجی جوان و ڕێك و پێك.

لە ماڵی ئیبراهیم لایاندا، ئیبراهیم بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو و ڕێزێکی زۆری لێ گرتن، خێرا ڕۆیشت گوێرەکەیەکی سەرِ بڕی و بۆیان چاکی کرد و هێنایە سەر سفرە فەرمووی لێ کردن بەڵام هیچ کامیان نەڕۆیشتنە پێشەوە.

ئیبراهیم کەبینی زۆر ترسا وتی: تۆ بڵێی خواردنەکەیان بە دڵ نەبێ، فریشتەکان وتیان: ئەی ئیبراهیم مەترسە، ئێمە فریشتەی خواین خوا ناردوونی بۆ لای هۆزی (لوط)بۆ ئەوەی سزایان بدەین، لەسەر ئەو کارە ناشیرینەی کە ئەنجامی دەدەن، مژدەت لێ بێت خودای پەروەردگار منداڵێکتان پێ دەبەخشێ بە ناوی ﴿ئیسحاق﴾ و دەیکات بە پێغەمبەر.

ئیبراهیم زۆر خۆشحاڵ بوو بەو مژدەیە بەڵام لەگەڵ سارەی هاوسەریدا زۆر سەریان سوڕما، وتیان وەك دەبینن ئێمە تەمەنمان بەسەر چووە، تازە منداڵمان نابێت.

فریشتەکان وتیان: ئایا لە کاری خودای گەورە سەرتان سوڕدەمێنێ؟ ئەوە فەرمانی خوایە و دەبێت جێ بەجێ بێت.

## * پاش لە دایك بوونی:

پاش ئەوەی ئیسحاق لە دایك بوو، باوك و دایکی زۆریان خۆش دەویست، بەردەوام چاودێریان دەکرد، بە شێوازێکی زۆر جوان و رێك و پێك پەروەردەیان کرد .

هەر بەمنداڵی خودای پەروەردگار بەهرەیەکی پێ بەخشی بوو زۆر زیرەك و کارزان بوو، زانستێکی زۆری دەزانی.

وردە وردە تەمەنی گەورە بوو، تا وای لێ هات کاتی ئەوەی هاتبوو ژن بهێنێ و ژیانی هاوسەرگیری پێك بهێنێ.

کچێکی خواست بە ناوی ﴿رەفقا﴾

لەم هاوسەرەی خودای پەروەردگار دوو منداڵی پێ بەخشی بە ناوی ﴿عیص﴾و ﴿یەعقوب﴾.

هەموو نەوەی (بەنی ئیسرائیل) لە نەوەی دووەم کوڕی بوو، واتە هەمووی دەچێتەوە سەر ﴿یەعقوب﴾

## *بانگ کردنی هۆزەکەی بۆ خوا پەرستی :

ئەو شوێنەی ئیسحاقی تێدا دەژیا، هۆزێك بوون ئەوەندە خۆشەویستی ماڵ و سەروەت و سامان چوو بووە دڵیانەوە بیریان بەلای خواپەرستیەوە نەمابوو.

خودای پەروەردگاریش فەرمانی بە ئیسحاق کرد ئاگاداریان بکاتەوە، ئیسحاق داوای لێ کردن بگەڕێنەوە بۆ خواپەرستی، زۆر خەریك بوو لەگەڵیان بەلام بێ سوودبوو.

دەیانوت ئەی ئیسحاق بە ڕاستی سەروەت و سامان بۆ ئێمە هەموو شتێکە، گەر خواپەرستی نەکەین نامرین لە برسانا، بەلام گەر سەروەت و سامانمان نەبێ لە برسانا لەو کۆلانانەدا دەکەوین و کەس نایە بە هانامانەوە.

لەبەر ئەوە وازمان لێ بێنە با کارەکەی خۆمان ئەنجام بدەین.

ئیسحاق بەدرێژایی تەمەنی خەریك بوو لەگەڵیان، فێری خواپەرستی دەکردن، بەلام کەمێکیان نەبێت بە قسەیان نەکرد.

## * دژایەتی نێوان ﴿عیص﴾و﴿یەعقوب﴾

دەگێڕنەوە کە (ئیسحاق ) بە ساڵداچوو، چاوەکانی کزبوون، ئارەزووی لە خواردنێك بوو کە (عیص)بۆی دروست بکات، (عیص)ڕاوچیەکی شارەزابوو، ئەو ڕۆیشت تا شتێ بۆ باوکی پەیدا بکات.

لە ملاشەوە(ڕەفقا)ی دایکی بە یەعقوبی کوڕی وت: بڕۆ دووکاری زۆر جوان سەربڕە و بیکە بەو خۆراکەی کە باوکت حەزی لێ نەکات.

ڕۆیشت سازی کردوو بەرگەکانی (عیص)ی برای لەبەر کردو چەرمی توکنی دوو کارەکەی بە قوڵ و ملی خۆیەوە چەسپ کرد، چونکە (عیص)تووکن بوو. ئیتر خواردنەکەی بۆ برد باوکی پرسی تۆ کێیت؟ وتی: من کوڕەکەی خۆتم، (ئیسحاق) لەبەرخۆیەوە دەیوت: دەنگەکەت دەنگی یەعقوبەو بەرگ و لەش و لاریشت (عیص)ە

کاتێك تیری خوارد، لە خودای گەورە پاڕایەوە بیکاتە گەورەی گەلان، ڕۆزی و منداڵی زۆری پێ ببەخشێ.

پاش ماوەیەك (عیص) لە ڕاوهاتەوە و خواردنەکەی ئامادە کرد و هێنای لە پێش دەمی باوکی داینا، باوکی گوتی: ئەمەچی یە ڕۆڵە؟ گوتی: ئەوە ئەو خۆراکەیە کە ئارەزووت لێ بوو، وتی (ئەی پێش کەمێ نەتهێنا؟ خواردم و دوعاشم بۆ کردی وتی: نەبەخوا.

ئیتر (عیص) زانی کە ئەوە براکەی بووە، ئەو دەست پێشخەری کردووە، لێرەدا زۆر دڵی لە خۆی داما، تەنانەت بڕیاری دا بیکوژێت، کاتێك کە دایکی ئەمەی بیست یەعقوبی دوورخستەوە ناردی بۆلای (لابان)ی خاڵی لە خاکی حەران.

## * مردنی ئیسحاق:

تەمەنی ئیسحاق لە سەدساڵ زیاتر تێ پەری کردبوو، چاوەکانی بە تەواوی کزببوون.

لەگەڵ ئەمانەدا نەخۆشیەکی گرت زۆری ئازاردا بەردەوام لەسەری گرانتردەبوو، هەربەم نەخۆشیە لەسەر جێگەدا گیانی دەرچوو، گەڕایەوە بۆ خزمەتی پەروەردگار.

منداڵەکانی بردیان لە ئەشکەوتێکدا کە ئیبراهیم لە سەردەمی خۆیدا کڕیبووی لەلای باوکی داناشتییان.

# یوسف

( سەلامی خودای لەسەر بێت )

چاکترین و جوانترین چیرۆك و بەسەر هاتێ کە خودای پەروەردگار لە قورئاندا باسی کردبێت بەسەرهاتی ژیانی یوسفە.

یەك سورەتی تەواوی بە ناوی یوسفەوە ناو ناوە .

ناوی تەواویشی (یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە) سەلامی خوایان لەسەر بێت.

یازدە برای هەبوو بە ناوەکانی (بنیامین، ڕۆبیل، شەمعون، لاوی، یەهوزا، ئەیاخر، زایلۆن، حاد، ئەشیر، نفتالی، دان)

یوسف شەوێك لە خەویدا خەوێکی سەیری دیت گێڕایەوە بۆ باوکی وتی: لەخەودا یازدە ئەستێرەو خۆر و مانگم بینی کڕنۆشیان بۆ دەبردم باوکی وتی: ڕۆڵە گیان خەوەکەت مەگێڕەوە بۆ براکانت، نە وەکو بە هۆی ئەوەوە فێڵێکت لێ بکەن و تووشی بەلاییکت بکەن، چونکە ئەم خەوە داهاتوویێکی بڵند بۆ تۆ دەگەیەنێت، ئەوانیش حەسوودیت پێدەبەن.

پێی وت: خودای گەورە هەڵتدەبژێرێت و دەتکات بە پێغەمبەر لێکدانەوەی خەوت فێر دەکات و نیعمەتی خۆیت بەسەر دادەبارێنێ .

## * پیلان گێران بۆ یوسف:

براکانی یوسف هەستیان کردبوو باوکیان لە ئەندازە بە دەر یوسفی خۆش دەوێت، ئەوانی پشت گوێ خستوەو نازیان ناداتێ .

بۆیە لەناو خۆیاندا بڕیاریاندا بە هەر شێوازێك بێت یوسف بکوژن و لە ناوی بەرن

شەیتانیش زوو زوووە سوەسەی بۆ دروست دەکردن بۆ ئەوەی ئەو تاوانەیان پێ ئەنجام بدات.

دوای ئەو بڕیارە هاتنە لای باوکیان وتیان: ئەی باوکە بەڕاستی ئێمە زۆر دڵسۆزی یوسفین و زۆرمان خۆش دەوێت.

پێمان خۆشە لەگەڵمان بینێرێ بۆ ئەوەی گەمە و یاری بکات، بێگومان ئێمە پارێزگاری لێ دەکەینو ئاگامان لێی دەبێت .

باوکیان وتی: ئەترسم لەگەڵتان بینێرم و ئێوە لێی بێ ئاگابن و گورگ بیخوات.

کوڕەکان وتیان: سوێند بە خوا ئەگەر بێتو گورگ بیخوات، ئێمە زەرەرمەندین و شەرمەزاری لای تۆ دەبین.

بە هەر شێوازێك بێت باوکیان ڕازی کردو لەگەڵ خۆیان بردیان، هێشتا کەمێك دوورنەکەتبونەوە بەبەر شەق‌و زللەیاندا.

ویستیان بیکوژن بەلاَم یەکیان وتی: مەیکوژن ئەیخەینە ناو بیرەوە کراسەکەی خوێناوی دەکەین و باوکمانی پێ ڕازی دەکەین.

ئیتر هەموویان لەسەر ئەوە ڕێککەوتن‌و خستیانە ناو بیرێکەوە، کراسەکەیان هێناو خوێنی کارێکیان پێوەدا.

کە ئێوارە داهات، هەموویان بەگریانێکی زۆرەوە بەرەو لای باوکیان گەڕانەوە، وتیان: ئەی باوکی بەڕێزمان بە ڕاستی ئێمە ڕۆیشتین‌و پێشبڕکێمان دەکرد، یوسفمان لای کەل و پەلەکەمان بەجێ هێشت، ئەوسا گورگەکە پەلاماری داو خواردی.

بەلاَم تۆ هەمیشە بڕوامان پێ ناکەیت گەرچی ئێمە راستگۆش بین،

کراسەکەیان بۆ هێنا، بەلاَم باوەڕی پێ نەکردن و وتی گەر خودای گەورە یارمەتیم بدات لە ئارامگران دەبم.

## * فرۆشتنی یوسف:

لەو کاتەی یوسف لەناو بیرە کەدابوو، براکانی بەجێیان هێشتبوو کاروانێك بەو ناوەدا تێ پەڕی، یەکێکیان نارد لە بیرەکە ئاویان بۆ بهێنێ.

کاتێك سەتڵەکەی شۆڕکردەوە یوسف چووە ناوی و بەرزی کردەوە لە بری ئاو ئەم منداڵەی بینی،

بۆیە هاواری کرد وتی: مژدە بێت ئەمە لاوێکە، کە بینیان منداڵێکی زۆر جوانە، بڕیاریاندا بیبەن لە میسر بی فرۆشن.

بەرێ کەوتن تا گەیشتنە میسر لەوێ یوسفیان بردە بازاڕی کۆیلە فرۆشەکانەوە و دایان نا بۆ فرۆشتن.

عەزیزی میسر کە وەزیری گەنجینە بوو خێزانێکی هەبوو بە ناوی (زولەیخا) منداڵی نەبوو، ئیتر یوسفی بە چەند درهەمێکی کەم کڕی و بردیەوەماڵەوە.

وتیە: هاوسەرەکەی ڕێز لەم منداڵە بگرە بە ئومێدی ئەوەی سوودمان پێ بگەیێنێ یان بیکەینە کوڕی خۆمان.

بەم شێوازە یوسف لە باشترین جێدا نیشتەجێ بوو.

## * ناپاکی زولەیخا بەرامبەر بە یوسف:

کاتێك یوسف لەو ماڵەدا پێگەشت و گەورەبوو خودای پەروەردگار دانایی و زانیاریەکی باشی پێ بەخشی بوو لەگەڵ ئەوەشدا جوانیەکی پێ بەخشی بوو هیچ کەس لەو شارەدا بە قەدەر ئەو جوان نەبوو. هەر لەبەر جوانیەکەی بوو زولەیخا ڕۆژێك فرسەتی لێ وەرگرت و ویستی کاری خراپەی لەگەڵ بکات.

لەسەرەتاوە بردیە ژوورەوەو هەموو دەرگاکانی لێ داخست و پێی وت: وەرە پێشەوە خۆت ئامادە بکە.

یوسف وتی: پەنا دەگرم بەخوا کاری واناکەم، مێردەکەشتی، ڕەفتاری چاك بووە لەگەڵم، خیانەتی لێ ناکەم.

زولەیخا پەلاماری داو ویستی لێی بدات، بەڵام یوسف ڕای کرد بەرەو دەرگاکە زولەیخاش بە دوایدا ڕایکرد یوسف ویستی دەرگاکە بکاتەوە .

لە دواوە پەلەماری داو کراسەکەی دڕاند.

کە دەرگاکەی کردەوە، مێردی زولەیخا هەردووکیانی بینی.

زولەیخا خێرا هاتە قسەو ویستی یوسف تاوانبار بکات وتی: ئاخۆ سزای ئەو کەسە چی بێت کە بیەوێت خیانەت لە هاوسەرەکەت بکات، جگە لەوە بەند بکرێت یان سزایەکی بە ئێش بدرێت.

یوسف هاتە قسەو پارێزگاری لە خۆی کرد وتی: بەڕاستی وانیە، ئەو ویستی من لە خشتە بەرێت.

یەکێ لە خزمانی زولەیخا گوێی لە بەسەرهاتەکەبوو شایەتی داو وتی: ئەگەر کراسەکەی یوسف لە پێشەوە دڕابوو ئەوە زولەیخا ڕاست دەکات و یوسف یەکێکە لە درۆزنان، بەڵام ئەگەر لە دواوە دڕابوو، ئەوە زولەیخا درۆ دەکات و یوسف یەکێکە لە ڕاست گۆیان، کە سەیریان کرد کراسەکە لە دواوە دڕابوو، بۆیە مێردەکەی زولەیخا وتی: ئەی یوسف ئەم باسە لای کەس باس مەکە و بیشارەوە.

زولەیخا تۆش داوای لێ خۆشبوون بکە لە هەڵەو تاوانەکەت، چونکە بە ڕاستی تۆ لە گوناهباران و بە هەڵە چووانی.

بەڵام ماوەیەکی کەم بەسەر ڕووداوەکەدا تێ پەری بوو هەواڵەکە بڵاوبوویەوە .

ژنانی ئەو شارە گاڵتەیان بە زولەیخا دەکرد .

ئەویش بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ بە دەست خۆی نەبووە، جوانی یوسف وای لێ کردووە.

ناهەنگێکی گێڕاو هەموو ژنەکانی بانگ کردو هەریەکەو چەقۆیەکی دایە دەستیان، خەریکی میوە لەت کردن بوون.

فەرمانی کرد، یوسف بە ناویاندا تێ پەڕێ، کاتێك کە تێ پەری هیچیان ئاگایان لە خۆیان نەما لەتاو جوانی یوسف، هەموویان دەستی خۆیان، بڕی، بێ ئەوەی ئاگایان لە خۆیان بێت.

وتیان: بەراستی ئەمە مرۆڤ نیە، تەنها فریشتەیەکی جوان و بەرێزەو هیچی تر.

زولەیخا وتی: ئەوە ئەو کەسەیە کە ئێوە لۆمەو سەرزەنشتی منتان دەکرد لە بارەیەوە.

سوێند بەخوا گەر ئەوەی من دەمەوێت ئەنجامی نەدات، ئەوا بە ڕاستی بەند دەکرێت و زەلیل دەبێت و بە کەم تەماشا دەکرێت، کە یوسف ئەمەی بیست وتی: پەروەردگارا بە ڕاستی من زیندانم لاخۆشە ویست ترە لەوەی کە ئەوان بۆی بانگم دەکەن.

## * یوسف لەناو زیندانىدا :

خودای پەروەردگار بەدەم داواکەیەوە هات و ڕزگاری کرد لێیان، زۆلەیخا زانی خۆی نادا بە دەستەوە بڕیاریدا بەند بکرێ.

کاتێك چووە ناو زیندانەکەوە، دوولاوی تریش بە تاوانی جیا جیا.

لەگەڵیدا هاتنە بەندیخانەوە، یەکیان مەی گێڕی پاشابوو ئەو یتریان نان ئامادە کاری بوو.

هەردووکیان لە یەك شەودا هەریەکەو خەوێکی بینی، بەیانی کە ڕۆژبوویەوە ڕۆیشتن بۆلای یوسف و خەوەکەیان بۆ گێڕایەوە .

کابرای مەی گێر وتی: لە خەوما ترێم دەگوشی و شەرابم لێ دروست دەکردو دەمدا بە دەمی پاشاوە.

ئەوی تریان وتی: سەبەتە نانم بەسەر سەرمەوە هەڵدەگرت، باڵندەلێیان دەخوارد، یوسف پێش ئەوەی خەوەکەیان بۆلێك بداتەوە پێی وتن: پێش ئەوەی ژەمەخواردنێکتان بۆ بێتو بیخۆن، پێتان دەڵێم چییە.

هەر خواردنێکتان بۆ بێت پێش ئەوەی بگاتە لاتان من دەزانم چیە، ئەمەش ئازایەتی خۆم نییە، خودای پەروەردەگار فێری کردووم. پاشان ڕووی تێ کردن ووتی: ئەی هاوەڵانی زیندانم: ئایا چەند خوایەکی هەمە جۆرە و جیاواز بپەرسترێن چاکترە، یاخود خوایەکی تاك و تەنها و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدا؟

جا هەرچی ئێوە دەیپەرستن جگە لە خوا، تەنها خۆتان و باو باپیرانتان ناوتان لێناون، ئەگینا خوا هەرگیز بەوە ڕازی نیە.

بە ڕاستی حوکم و فەرمان ڕەوایی جگە لە خوا شایستەی کەسی تر نیە، فەرمانیشی داوە جگە لە خۆی کەسی تر نەپەرستن.

پاش ئامۆژگاری کردنیان وتی: ئەی هاوەڵانی زیندانیم .

ئەوەتان لەخەونیدا ترێی دەگوشی ئەوە دەبێتە مەی گێڕی پاشاو ڕزگاری دەبێت، ئەوەی تریش لە خاچ دەدرێت و باڵندە لەسەرو ڕوخساری دەخوات.

پاشان یوسف بە مەی گێڕەکەی وت کە چوویت بۆ لای پاشا باسی منی بۆ بکەو بڵێ بەبێ تاوان گیراوە.

کابرای مەی گێڕیش شەیتان لە بیری بردبووەوە باسی یوسف بکات لە لای پاشا.

خودای گەورە لەبەر ئەو کارەی چەند ساڵێکی تر لە زینداندا هێشتیەوە بۆ ئەوەی ببێ بە دەرس بۆی.

## * ڕزگاربوونی لە زیندان:

شەوێك پاشا خەونێکی زۆر سەرسوڕهێنی بینری، کە ڕۆژ بوویەوە فەرمانی دا هەموو زاناکان کۆبکەنەوە.

کاتێ کە هەموویان لە کۆشك ئامادەبوون پاشا وتی: بە ڕاستی من لەخەومدا بینیم کە حەوت مانگای قەڵەو لەلایەن حەوت مانگای لەڕو لاوازەوە خوران ، حەوت گوڵە گەنمی سەوزو جوان و حەوتی وشکیشم بینی، زانایان هەموویان واقیان وڕماو هەرچیان کرد، بۆیان لێك نەدرایەوە .

بۆ ئەوەی خۆیان دەرباز بکەن وتیان: ئەم خەو نەبێ سەرو بنە هیچ نیەو ئێمە لە لێکدانەوەی خەونی بێ سەروبن شارەزانین.

لەوکاتەدا مەی گێڕەکە یوسفی بیرکەوتەوە، وتی: ئەی پاشا بمنێرە، من کەسێك پێ دەزانم لە لێك دانەوەی خەوندا شارەزاییەکی زۆری هەیە.

مەی گێرەکە ڕۆیشت بۆ لای یوسف و خەونەکەی پاشای بۆ گێرایەوە،

یوسف خەونەکەی بۆ لێك دایەوە و وتی: حەوت ساڵی تەواو کشتوکاڵ دەکەن و دانەوێڵە دەچێنن، ئەوەی کە دروێنەتان کردو لێتان زیادبوو بە گوڵەکەیەوە بیهێڵنەوە، مەگەر ئەو کەمەی کە دەیخۆن، پاشان لە دوای ئەوە حەوت ساڵ گرانیی و سەختی پێش دێت، ئەوەی کە زەخیرەتان کردووە بۆ ئەو ساڵانە هەمووی دەخۆن ، مەگەر کەمێکی نەبێت کە هەڵی دەگرن بۆ تۆ.

لە وەو دوا ساڵێکی باراناوی پڕ بەرەکەت دێت، کە خەڵکی بەروبووومی زۆریان پێ دەبەخشرێت.

کابرای مەی گێر لێکدانەوەی خەوەکەی بەپاشا راگەیاند، پاشا زیرەکی یوسفی بۆ دەرکەوت وتی: بڕۆن ئازادی بکەن و بیهێنن بۆ لام، کە چوون بۆ لای یوسف وتی: بڵێن بە پاشا تاپاکیەتیم دەر نەکەوێت لەلای خەڵکی، هەرگیز نایەمە دەرەوە.

کە پاشا ئەمەی بیست زولەیخاو ئەو ئافرەتانەی بانگ کرد کە دەستی خۆیان بڕی بوو.

لێی پرسین ئایا ئەو کارە چی بوو کە ویستتان یوسف لە خشتە بەرن.

ئایا ئەو هیچ تاوانێکی هەبوو.؟

هەموو وتیان: پەنا بەخوا، ئێمە هیچ جۆرە هەڵەو ناشیرینیەکمان لێ نەدیوە .

زولەیخاش وتی: ئا ئێستا ئیتر ڕاستی ڕوون و ئاشکرا بوو، دان بە ڕاستیدا دەنێم، خەتای من بوو، دەم ویست لە خشتەی بەرم.

کە هەواڵەکە بەیوسف گەیشتەوە، یوسف وتی: بۆیە وام کرد لەبەر ئەوەی پاشا دڵنیا بێت کە من لە نهێنیشدا خیانەتی لێ ناکەم .

لە پاشاندا لە زیندانەوە بەرەو کۆشکی پاشا کەوتە ڕێ.

پاشا پێی وت: ئیتر ئەمرۆ تۆ لای ئێمە خاوەنی پلەو جێگەی متمانەو باوەڕی.

یوسف پێی وت: پێم باشە بمکەیت بە لێپرسراو بەسەر سامانی گەنجینەکانی ئەم وڵاتە. پاشاش داواکەی جێ بەجێ کرد.

## * بە یەکتر گەیشتنەوەی یوسف و براکانی:

پاش ئەوەی یوسف کرا بە لێپرسراوی گەنجینەو سامانی وڵاتی میسر، بەردەوام کاری دەکرد بۆ ئەوەی ئەو خەڵکە لە گرانی ساڵی بێ بارانی بپارێزێت.

ئەو حەوت ساڵەی سەرەتا دانەوێڵەیەکی زۆری بە گوڵەکەیەوە پاشەکەوت کرد.

حەوت ساڵەکە تەواو بوو ،حەوت ساڵی گرانی و بێ بارانی دەستی پێ کرد.

لە دەوروبەری میسرەوە خەڵکی پۆل پۆل لە برسان ڕوویان دەکردە ئەم وڵاتە.

یەکێ لەم کاروانانەی کە هات بۆ میسر براکانی یوسف بوون.

یوسف کە ئەوانی بینی هەموویانی ناسیەوە، بەڵام ئەوان ئەمیان نەناسیەوەو هەر بە خەیاڵیشیاندا نە دەهات کە یوسف بێت.

یوسف زۆر ڕێزی لێ گرتن و دانەوێڵەی باشی دا بەهەموویان، پاشان پێی دەرخستن کە برایەکی باوکیان هەیە نەیان هێناوە.

یوسف پێی وتن: ئەم جارە گەڕانەوە براکەتان لەگەڵ نەبێت ئەوا ئیتر بە هیچ شێوەیەك هیچتان لای من دەست ناکەوێ .

براکانی وتیان: هەوڵ دەدەین باوکمان ڕازی بکەین، کە بەرەو فەڵەستین بەرێ کەوتن یوسف فەرمانی دا پارەکەیان بۆ بخەنەوە ناو بارەکانیانەوە بۆ ئەوەی بزانن ئێمە ڕێزی باشیان لێ دەگرین و جارێکی تر بگەڕێنەوە.

کە گەڕانەوە بۆماڵەوە وتیان: ئەی باوکی بەڕێزمان بڕیاریان داوە هیچ شتێکمان پێ نەفرۆشن گەر لەم کاروانەدا بنیامینمان لەگەڵ نەنێری. دڵنیابە دەی پارێزین.

باوکیشیان زانی حاڵیان زۆر خراپە وە دانەوێڵەیان نەماوە لەگەڵیان ناردی بەڵام پەیمانی لێ وەرگرتن هەموویان پەیمانیان دا کە بیپارێزن.

کاتێك ڕۆیشتن بۆ میسر چوونە ژوورەوە، بۆ لای یوسف، بنیامینی برای لە خۆی نزیك کردەوەو وتی: بە ڕاستی من یوسفی براتم، جا خەفەت مەخۆ و خەمت نەبێت بەو هەڵسوکەوتەی ئەوان دەیان کرد. نەخشەم کێشاوە تۆ لێرە بهێڵمەوە.

کاتێك یوسف دانەوێڵەی بۆ کێشان و بۆی پێچانەوە، جامۆڵکەی کێشانەو پێوانەکەی خستە ناو باری بنیامینەوە.

بەڕێی کردن و ڕۆیشتن ، بەڵام پێش ئەوەی لە شارە دەرچن پاسەوانەکان بانگیان کردن وتیان جامولکەی پاشامان نەماوە.

هەموویان گەڕانەوەو وتیان: سوێندبێت ئێمە کاری واناشیاو ناکەین، پێی وتن پاداشتی ئەو کەسە چی بێت گەر درۆ بکات.

هەموویان وتیان لای خۆتان بەندی بکەن و بارمتە بێ لاتان.

یوسف دەستی کرد بە گەڕان بە ناو هەموو بارەکاندا پێش باری بنیامین، لە پاشان بارەکەی بنیامین گەڕاو دۆزیەوە.

براکانیان وتیان: ئەگەر ئەو دزی بکات، ئەوا براکەشی بێگومان دزی کردووە لە مەوپێش، یوسف زۆر تووڕەبوو لێیان بەڵام دەری نەبڕی، کاتێك بنیامینیان بە بارمتە گرت، هەموویان بە یوسفیان وت ئەی پاشا بە ڕاستی بنیامین باوکێکی پیری هەیە پەیمانمان پێ داوە بۆی بگەڕێنینەوە، لە بری ئەو یەکێ لە ئێمە لای خۆت بهێڵەرەوە، یوسف وتی: پەنا بەخوا ، ئێمە هەرگیز کاری وا ناکەین ، گەر وا بکەین ئەوا بێ گومان ئێمە لە ستەم کارانین.براکانی تەواو بێ ئومێد بوون، هەموویان گەڕانەوە تەنها گەورەکەیان نەبێ، هەواڵیان بە باوکیاندا ، یەعقوب کە ئەمەی بیست ئەوەندەی تر خەفەتی خوارد ئەوەندە گریا چاوی سپی هەڵگەڕا و ئاوی سپی تێزاو بینینی نەما.

پاش ماوەیەك یەعقوب کوڕەکانی ناردەوە بۆ میسر و پێی وتن: ڕۆڵەکانم بڕۆن و چاوبگێڕن بۆ یوسف و براکەی، لە سۆزو میهرەبانی خواش نا ئومێد مەبن.

کە لوپەلێکی تێکەڵ و پێکەڵی بێ نرخیان بردوو وتیان : ئەی پاشا بەڵکو لێمان وەرگری، چونکە بە ڕاستی تووشی گرانیەکی زۆر خراپ بووینە) .

یوسف لەو کاتەدا وتی: کاتی ئەوە هاتووە خۆمیان پێ بناسێنم .

وتی: ئایا دەزانن کاتی خۆی چیتان لە یوسف و براکەی کرد..

هەموویان چاویان ئەبڵەق بوو ، وتیان ئایا بە ڕاستی تۆ یوسفی ،

وتی : بەڵێ ئەمەش بنیامینی برامە.

ئیتر هەموویان سەریان شۆڕکردوو بە خۆیاندا چوونەوەو وتیان: بە ڕاستی کاتی خۆی ئێمە بە هەڵەداچوو بووین.

یوسف وتی: خەمتان نەبێت ئیتر ئەمڕۆ هیچ سەرزەنشتێکتان لەسەر نیە .

یوسف هەواڵی باوکی پرسی کە زانی نابینابووە، کراسەکەی خۆی پێی دانادرن و وتی: بڕۆن ئەم کراسەم بەرن و بیدەن بەسەرو ڕووی باوکمدا بینایی بۆ دەگەڕێتەوە و چاوی چاك دەبێتەوە، پاشان هەموو کەس و کارتانم بۆ بهێنن بە گشتی.

کە بردیان چاوی‌و چاك بوویەوە و هەموویان هاتن بۆ میسر لەوێ ژیانیان بەسەر برد.

# داود

**( سەلامی خودای لەسەر بێت )**

**خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرمووێت:**

﴿اصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَاذْكُرْ عَبْدَنَا دَاوُودَ ذَا الْأَيْدِ إِنَّهُ أَوَّابٌ *

إِنَّا سَخَّرْنَا الْجِبَالَ مَعَهُ يُسَبِّحْنَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِشْرَاقِ * وَالطَّيْرَ مَحْشُورَةً كُلٌّ لَهُ أَوَّابٌ* وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ﴾ [ص: ١٧ - ٢٠]

**واتە : یادی بەندەمان داود بکە کە توانایی و دەسەڵاتمان پێ بەخشی بوو، بەڕاستی ئەو هەمیشە دڵی لای ئێمە بوو، بە تەنگ ڕەزامەندی ئێمەوە بوو .**

**بە ڕاستی ئێمە کەژو کێوەکانمان بۆ ڕام هێنابوو، ئەوانیش یادو تەسبیحاتی خوایان دەکرد و پێکەوە دەیان و تەوە لە دەمەو ئێواران و بەرەبەیانەکاندا .**

**هەروەها باڵندەکانیشمان بۆ رام هێنا بوو بە دەوریشیدا کۆکرابوونەوە، هەموویان پێکەوە تەسبیحاتیان دەکرد. هەموویان گوێڕایەڵ و فەرمان بەرداری خوابوون.**

**ئێمە پاشایەتیەکەمان بەهێزکردو حیکمەتو دانانی و قسەو فەرمانی بەجێمان پێ بەخشی.**

**منداڵە چاوگەشەکان وەرن با پێکەوە گەشتێك بکەین بە ناو ژیانی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەدا.**

**ناوی تەواوی (داودی کوڕی ئیشای کوڕی عابری کوڕی سلمون)ەو دەچێتەوە سەر پێغەمبەر ئیبراهیم سەلامی خودای لەسەر بێت.**

**خودای پەروەردگار هەڵی بژاردوو کُردی بە پێغەمبەری (بنی اسرائیل) .**

**ئەم هۆزەی داود پاشایەکیان هەبوو بە ناوی (طالوت)کە زۆر خواناس و ئازاو بلیمەت و چاو نەترسبوو، بەردەوام هۆزەکەی لە دەستی دوژمن دەپاراست و ڕزگاری دەکردن، پاشایەك**

هەبوو بە ناوی (جالوت)بەردەوام هێرشی دەکردە سەر ئەم هۆزەی داود و شەڕی لەگەڵ دەکردن.

بۆیە طالوت بڕیاریدا هێرش بکاتە سەر لەشکری جالوت و تێکیان بشکێنێ، بۆ ئەوەی ئیتر هێرشیان نەکرێتە سەر .

## * بە ڕێکەوتنی لەشکری طالوت:

طالوت لە شکرێکی زۆری کۆکردەوە و بەرەو ڕووی لەشکری جالوت ڕۆیشتن، داودیش یەکێ بوو لە سەربازەکانی طالوت .

کە کەوتنەڕێ لە ڕێدا تووشی بێ ئاوی و ماندوو بونێکی زۆر بوون .

طالوت ویستی لەشکرەکەی تاقی بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانی تا چەند گوێڕایەڵی دەکەن.

لەڕێگەدا گەیشتن بە ئاوێك، طالوت پێی ڕاگەیاندن وتی: نابێت بە هیچ شێوەیەك لەو ئاوە بخۆنەوە ، هەر کەس فەرمانم بشکێنێ ئەوە لەگەڵ ئێمە نایەت و دەبێ بگەڕێتەوە .

کاتێك بە ئاوەکە گەیشتن کۆمەلێکی زۆر خۆیان نەگرت و لە ئاوەکەیان خوارد، طالوت کە بینی هەر هەموویانی دەکرد و گەڕاندنیەوە.

بەشێکی کەم مایەوە لە لەشکرەکە بەلاّم چاونەترس و ئازابوون ، ڕۆیشتن تا گەیشتنە لەشکری جالوت .

بەرامبەر یەك وەستان و جالوت بەسەر ئەسپێکەوە دەهات و دەچوو گاڵتەی بە طالوت دەکردو دەیوت: کێ ئازایە بێتە بەرامبەرم بوەستێ .

طالوت وتی: ئەی سەربازەکانم کێتان بەرامبەری جالوت دەبێتەوە، هیچ کامیان نەیان وێرا سەرهەڵ برن، لەبەر ئەوەی جالوت زۆر ئازاو چاو نەترس بووە.

داود دەستی هەڵبڕیوو وتی: من دەتوانم.

چەند بەردێکی هەڵ گرت و ڕۆیشتە بەرامبەری جالوت، کە بینی تێر پێی پێکەنیوو وتی: لاچۆ تۆ بەرگەی یەك زللە ناگری، بڕۆ گەورەکەتم بۆ بانگ بکە، چەند جارێ ئەم قسەیەی دووبارەکردەوە، بەڵام هەر دواود وازی لێنە هێنا، کە بینی واز ناهێنێ لێی چووە پێشەوە و ویستی شمشێرێکی لێبدات ، داود یەك بەردی تێگرت و دای لە چاوی کوێری کردوو پاشان خستی بەزەویدا.

ئەوەندە بەتوندی بەردەکەی لێدا هەڵنەسایەوە و هەر لەوێدا مرد .

لەشکرەکەی جالوت کە بینیان سەرکردەکەیان مردووە، ئیتر هەموویان پشتیان شکاو ڕایان کرد .

طالوت و لەشکرەکەشی سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا، سەربازەکانی طالوت هەر کە داودیان بەو ئازایەتیەوە بینی، خێرا طالوتیان بەجێ هێشتوو داودیان کرد بە پاشای خۆیان .

## * سیفەتەکانی داود:

داود یەکێ بوو لەو پێغەمبەرانەی کە سیفەتی جوان و نایاب و بێ وێنەی تێدابووە.

لەوانەش.ئەوەندە دەنگی خۆش بووە، هیچ کەس لەو سەردەمەدا نەبووە بە قەدەر ئەو دەنگی خۆش بوو بێت، دەڵێن کاتێ کتێبی زەبوری دەخوێندەوە، هەموو باڵندەکان گوێیان لێ دەگرت و لەسەرسەریەوە دەوەستان.

وەکو خودای گەورە دەفەرموێت، کەسێك بوو بەردەوام یادی خودای کردووە، خودای گەورە شاخ و کێوەکانی بۆ ڕام هێنابوو، پێکەوە بەیانیان و ئێواران تەسبیحاتی خوایان دەکرد.

هەرچی باڵندە هەیە بۆی موسەخەرکرابوو لەلایەن خواوە، بە فەرمانی داود هاتووچۆیان دەکرد، لەگەڵ ئەویشدا تەسبیحاتیان دەکرد .

خودای پەروەردگار توانایەکی پێدابوو، ئاسنی بە دەست لاردەکردەوە و شتی لێ دروست دەکرد، بەبێ ئەوەی گەرمی بکات.

لەو هەمووو سەروەت و سامانە ڕۆژێك بە ڕۆژ و دەبوو ڕۆژێك نەیدەگرت.

کاتێك حوکمڕانی خەڵکی دەکرد، زۆر بە داد پەروەرانە ئەنجامی دەداو خیانەتی لە کەس نەدەکرد.

ئەمانە و چەند سیفەتێکی تر کە وای کرد بوو، خەڵکی خۆشیان بوێت و بەردەوام لە فەرمانی دەرنە دەچوون.

## * مردنی داود:

ئەو سەردەمەی کە داود پێغەمبەر و پاشای (بني اسرائيل) بوو گەورەترین دەسەڵاتی پەیدا کردبوو لە جیهاندا.

لەشکرێکی دروست کردبوو هیچ کەس نیدەتوانی بەرەنگاریان ببێتەوە .

لە ڕووی خواپەرستیەوە زۆر بەشێوازێکی جوان خەڵکەکەی فێری خواپەرستی کردبوو، هەموویان باوەڕیان پێ هێنابوو .

لە پاش تەمەنێکی زۆر لە خزمەت کردن بە پەیامی خوا، وە فێرکردنی خەڵکی بە دینداری و خواناسی. مردو گەڕایەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە، ئەو ڕۆژەی کە مرد گەرمایەکی زۆر تینی هێنابوو بۆ خەڵکەکە کە نەیان دەتوانی بە خاکی بسپێرن، لەو کاتەدا سولەیمانی کوڕی داوای لە خودای گەورە کرد باڵندەکانی بخاتە ژێر دەست و بە قسەی بکەن.

ئەوەبوو فەرمانی کرد بەسەر هەموو باڵندەکانداو پێی وتن: بەباڵتان لە لەسەرسەرمانەوە بوەستن و سێبەرمان بۆ بکەن تا باوکم دەنێژین، هەموو باڵندەکان هاتن و سێبەریان کردو خەڵکەکەش داودیان ناشت، دوای ناشتنی هەموویان دەستیان کرد بە گریان و زۆر نارەحەت بوون.

# (سولەیمان)

**(سەلامی خودای لەسەربێت)**

**خودای پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەی دەفەرموێت:**

( وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَيْءٍ إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْفَضْلُ الْمُبِينُ [النمل : ١٦]

**واتە:**

**سولەیمان جێنشینی داودی باوکی بوو، رۆژێك وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێری زمانی باڵندەکراوین و لە هەموو شتێکمان پێ دراوە، بە ڕاستی ئەمە فەزڵ و ڕێزێکی ئاشکرایە لەلایەن خواوە پێمان بەخشراوە**

**ئێستاش وەرن با پێکەوە گەشتێك بکەین بە نێو ژیانیدا، پەندو ئامۆژگاریو دەرسی لێوە فێربین.**

**ناوی تەواوی (سولەیمان ی کوڕی داودی کوڕی ئیشای کوڕی عابری کوڕی سلمون)ە**

**داود کە مرد منداڵ و نەوەی زۆری لێ بەجێ ما، خۆشەویسترینیان لەلای سولەیمان بوو ، هەر لەبەر ئەوەش فێری زۆرێك لە زانیاریەکانی کردبوو، لە کاتی دادوەریشدا سەعاتێك لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ ئەوەی فێری حوکمەکان بێت.**

## * سەرەتای دەرکەوتنی موعجیزەکانی سولە یمان :

**یەکەم موعجیزەی سەرسوڕهێنەر کە ڕووی دا لە پاش وەفاتی باوکی، ئەوەبوو کە داوای کرد لە خودای گەورە باڵندەکان بخاتە ژێر دەستیەوە و بە قسەی بکەن ، ئەوەبوو خودای گەورەش داواکەی قبووڵ کرد، لە کاتی ناشتنی باوکیدا گەرمایەکی زۆر تینی بۆ هێنابوون**

فەرمانی کرد بە باڵندەکان سێبەریان بۆ بکەن و لە تینی خۆر بیان پارێزن، ئەوەبوو هەر چی باڵندە هەیە لەسەرسەریان وەستان و سێبەریان بۆ کردن تا داودیان ناشت.

کە خەڵکەکە ئەمەیان لە سولەیمان بینی زانیان ئەمیش وەك باوکی، خودای گەورە دەسەلأتی پێ داوە و کردوویەتی بە پێغەمبەر، خێرا کردیان بە پاشاو باوەڕیان پێ هێنا .

سولەیمان داوای کرد لە خودای گەورە دەسەلأتێکی پێ ببەخشێ کە نە لەمەو پێش کەس بوبێتیو و نەلەمەو دواش کەس هەیبێت.

خودای گەورە دوعاکەی گیرا کرد، ئەوەبوو هەرچی پەری هەیە لە ژێر دەستی دابوو و بە فەرمانی ئەو دەجولأنەوە.

لە هەمان کاتدا هەرچی ئاژەڵ و باڵدارە لە ژێر دەستی دابوو و دەیزانی قسەشیان لەگەڵ بکات.

جگە لەمانە چەندەها شتی تریشی لە ژێر دەستیدا بوو، کە بە هیچ شێوەیەك لە فەرمانی لایان نەدەدا.

## * سولەیمان و پەپوو:

سولەیمان هەروەك چۆن لەناو خەڵکیدا دادوەری دەکردو لێپێچینەوەی لەگەڵ دەکردن .

بە هەمان شێوە لێپێچینەوەشی لەگەڵ پەریو ئاژەڵان و باڵندەکاندا دەکردو لێی دەپرسینەوە.

ڕۆژێك لەگەڵ دارو دەستەکەیدا بە ناو باڵندەکاندا دەگەڕان.

لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکردن لەسەر ئەو کارانەی کە پێی سپاردبوون.

کاتێك بە تەواوی گەڕابە ناویاندا، وتی: ئەوە بۆچی من پەپوو نابینم، یاخود لێرە نیە و خۆی دزیوەتەوە.

سوێند بێت ئەبێت سزایەکی زۆر سەختی بدەم یان سەری بېڕم، یان دەبێت بە بەڵگەیەکی ئاشکراوە بێت بۆ لام .

سولەیمان زۆر چاوەڕێی نەکرد پەپوو پەیدا بوو، یەکسەر نیشتەوە و وتی: ئەی سولەیمان ئەوەی من پێم زانیوە تۆ پێت نەزانیوە، من لە وڵاتی سەبە ئەوە هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆ هێناویت !!

بۆم دەرکەوت ئافرەتێك فەرمان ڕەواییان دەکات، لە هەموو جۆرە دەسەڵات و ناز ونیعمەتێکی پێ بەخشراوە .

تەختێکی پاشایەتی گەورەشی هەیە، بینیم خۆی و قەومەکەی سوژدە بۆ خۆردەبەن لە جیاتی خوا، شەیتان سەری لێ شێواندون وای لێ کردوون ڕێنموونی وەرناگرن.

سولەیمان بە پەپووی وتی: ئێمە لەمەودوا لەو گوفتارەی تۆ دەکۆڵینەوە، بزانین ڕاست دەکەیت یان لە درۆزنانیت.

ئەوسا سولەیمان نامەیەکی نووسی و دای بە پەپوو، فەرمانی پێدا بڕۆ ئەم نامەیە ببە و لە شوێنێکی بەرچاودا بۆیان فڕێ بدەو پاشان لە پەنایەکدا خۆت حەشاربدە بزانە دەڵێن چی و چ باس و خواسێ دەکەن.

پەپوو نامەکەی بردوو لە شوێنێکدا فڕێی داو خۆی حەشاردا.

شاژن هات و نامەکەی بینیو خوێندیەوە، پاشان وەزیران و ئەنجومەنەکانی خۆی کۆکردەوە، وتی:

ئەی ڕێزداران، بە ڕاستی من نامەیەکی پیرۆزو بەڕێزم بۆ هاتووە نامەکە لە لایەن سولەیمانەوەیەو تێیدا دەڵێت:(( بە ناوی خودای بەخشندەو میهرەبان))خۆتان بە گەورە مەزانن و لێم یاخی مەبن وەرن موسڵمان ببن.

جا بەڵقیس وتی: ڕاتان چیە، چی بکەم باشە؟

ئەنجومەنەکان وتیان: خۆت دەزانیت ئێمە خاوەنی هێزو دەسەڵاتین، فەرمانیش فەرمانی تۆیە.

بەڵقیس وتی: بە ڕاستي لەشکری پاشاکان کاتێك چوونە هەر شارو دێهاتێکەوە کاولیان کردووە.

من بڕیارم داوە دیاریەکیان بۆ بنێرم، بەڵکو وازمان لێ بهێنن .

کاتێ سولەیمان دیاریەکەی پێگەیشت توڕەبوو، فەرمانی دەرکرد تەختی بەڵقیسی بۆ بهێنن. دەستەی پەریەکان لە یەك چاوتروکاندا بۆیان هێنا .

بەڵقیس کە دەسەلاتی سولەیمانی بینی، خێرا وتی: بە ڕاستی من تا ئێستاستەمم لە خۆم کردووە و بێ ئاگابووم، بۆیە یەکسەر باوەڕی هێناو موسڵمان بوو.

## * مردنی سولەیمان :

سولەیمان لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەت و دەسەلات و توانایەی کە خودای پەروەردگار پێی بەخشی بوو، ویستی لە کۆتایی تەمەنیدا

سوپاسی خودای گەورە بکات و ماڵێکی گەورەی لە فەلەستین بۆ دروست بکات.

بۆیە فەرمانی کرد بەسەر هەموو دارو دەستەکەی، دەست بکەن بە بنیادنانی مزگەوتێك کە بێ وێنە بێت.

لەگەڵ ئەوانەشدا هەموو پەریەکانیشی هێناو کاری پێ دەکردن، وردە وردە مزگەوتەکە خەریك بوو تەواو دەبوو.

سولەیمانیش شوێنێکی تایبەتی خۆی هەبوو خواپەرستی تێدادەکرد.

ڕۆژێك بە پێوە خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا، پێش ئەوەی بەرزبێتەوە، پەریەکانیش نەیان زانی مردووە، تا دوای سێ ڕۆژ لە تەواو بوونی مزگەوتەکە مۆرانە لەگۆچانەکەیدا، قرۆڵی کردو کەوت.

ئەوجا زانیان کە مردووەو گەڕاوەتەوە بۆ خزمەتی خودای گەورە .

# (موسا)

﴿سەلامی خودای لەسەر بێت﴾

خودای پەروەردگار دەربارەی دەفەرمووێت :

﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ مُوسَى إِنَّهُ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا﴾ [مريم : ٥١]

**واتە : ئەی محمد یادی موسا بکە لەقورئاندا، بەڕاستی ئەویش کەسێکی هەڵبژاردە ودڵسۆزو پێغەمبەرو فروستادەبوو.**

**منداڵە چاو گەشەکان، وەرن پێکەوە گەشتێکی پڕ خۆشی و کامەرانی بکەین بە ناو ژیانی پێغەمبەر موسادا.**

**ناوی تەواو ی(موسای کوڕی عمرانی کوڕی قاهتی کوڕی عازری کوڕی لاوی کوڕی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە )**

**لە سەردەمی پاشایەکدا لە دایك بوو بە ناوی (فیرعەون)، کە گەورەترین بێ ئایین و ستەم کاری ئەو سەردەمە بوو .**

**ئەوەی کە فەقیرو هەژارو کەم دەست بوو لە زوڵم و ستەمی ئەم پاشا رزگاری نەدەبوو، هەموویان بە خۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە کرابوون بە خزمەتکاری ئەم پاشا خوانەناسە.**

## * سەرەتای لە دایك بوونی موسا :

فیرعەونی ستەم کارو لە خوا یاخی، هۆزو بنەماڵەکەی خۆی لە شوێنی بەرزو چاك و باش دادە ناو ڕێزی لێ دەگرتن، لە هەمان کاتیشدا (بني إسرائیل) کە هۆزو گەل و بنەماڵەیەکی تر بوون، زۆر بە خراپی هەموویانی دەچەوساندەوە و هەرچی کارو فەرمانی خۆی هەیە پێی ئەنجام دەدان .

زانایانی (بني إسرائیل) هەواڵێکیان بڵاو کردبوویەوەبە ناو خەڵکیدا تیایدا دەیانوت: منداڵێك لە (بني إسرائیل) لە دایك دەبێت، فیرعەونی ستەم کارو خوێن ڕێژ لە ناو دەبات .

کە ئەم هەواڵە بە فیرعەون گەیشت بڕیاریدا هەر کوڕێك لە دایك بێت لە ناو (بنی اسرائیل) دادەبێت بکوژرێت.

دەستیان کرد بە کوشتنی ئەو منداڵانەی لە دایك بوون، موساش لەو منداڵانە بوو کە لەو ساڵەدا لە دایك بوو، خودای پەروەردگار نیگای کرد بۆ دایکی لە ناو سندوقێکی دانێت و بیخاتە ڕووباری نیلەوە، دایکیشی فەرمانەکەی خودای گەورەی جێ بەجێ کردو بەگریانەوە خستیە ناو ئاوەکەوە .

ماڵی فیرعەون نزیکی ئاوەکە بوو، پاسەوانەکانی بە دەوریدا هاتووچۆیان دەکرد، پاش کەمێك لە ناو ئاوەکەدا سندوقێکیان بەدی کردو هێنایانە دەرەوە،

کە کردیانەوە سەیر دەکەن منداڵێکی بچوکی تێدایە، بۆیە بردیان بۆ لای پاشاو باسەکەیان بۆ گێرایەوە، هاوسەرەکەی فیرعەونیش داوای کردو وتی: ئەی پاشا خۆت باش دەزانی ئێمە کوڕمان نیە، با بۆخۆمان هەڵیگرین وبیکەین بە کوڕی خۆمان، ئیتر فیرعەونیش ڕازی بوو .

بەڵام هەرچیان دەکرد شیری هیچ ئافرەتێکی نەدەخوارد،

خوشکە گەورەکەی موسا بەو ناوەدا تێپەڕ بوو پێیانی وت: من ئافرەتێك دەناسم پێ دەچێ شیری ئەو بخوات، ڕۆیشتن بە دوایداو هێنایان کەشیری پێدا یەکسەر خواردی!.

بۆیە خودای پەوەردگار بە سۆزی خۆی موسای بۆ دایکی گەڕاندەوە پێی شاد کردەوە، کرێی لەسەر وەردەگرت و دەشی بردەوە ماڵی خۆیان.

## * هەڵهاتنی لە میسرەوە بۆ مەدیەن:

موسا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن زۆر لە کۆشك و ماڵی فیرعەوندا ژیانی بەسەر برد، زۆر بە شێوازێکی جوان رێزیان دەگرت .

رۆژێك بۆ پیاسەو گەڕان بە ناو کۆڵانەکانی میسردا هاتووچۆی دەکرد لە پڕ دوو پیاوی بینی یەکێکیان (بني اسرائيلي)ئەوەی تریان میسری بوو، بەیەکدا ئاڵابوون و شەریان دەکرد .

موسا ویستی لە یەکیان بکاتەوە، دەستێکی برد بۆ پیاوە میسریەکە هەر ئەوەندەی زانی کەوت بەزەویدا و گیانی دەرچوو بەبێ ئەوەی نیازی کوشتنی هەبێ .

خێرا لە ترسی فیرعەون خۆی کۆکردەوەو بەرەو بیابان رۆیشتو شاری میسری بەجێ هێشت.

چەند رۆژێك بەبرسیەتی لەو بیابانە گەرمەدا رێی پڕنا رەحەتیو ناخۆشی بڕی تا لە ئەنجامدا گەیشت بە مەدیەن و لەژێرسێبەری دارێك دانیشت و کەمێك حەسایەوە، پاش کەمێك دوو کچی بینی ڕانەمەڕێکیان پێبوو، نەیاندەتوانی ئاوی بدەن، ڕۆیشت مەڕەکانی بۆ ئاودان و بەجێی هێشتن و گەڕایەوە شوێنی خۆی .

ئەم دوو کچە بەڕێکەوتن و ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵ و باسەکەیان بۆ باوکیان گێڕایەوە ، بەباوکیان وت ئەگەر پێت باشە با بیکەین بە شوانی خۆمان، چونکە کەسێکی زۆر بەهێزو لێهاتوو بە ڕەوشتە.

باوکیان پێی وتن: بڕۆن بۆم بانگ بکەن، تا پاداشتی ئەو کارەی بدەمەوە.

کچەکان ڕۆیشتن پێیان وت: باوکمان بانگت دەکات و پێی خۆشە بتبینێ.

موسا لە پێشیانەوە ڕۆیشت تاگەیشتە ماڵیان و چووەلای باوکیان.

باوکی کچەکان کە موسای بینی زۆر خۆشحاڵ بوو ، پێی وت:وەك بۆیان باسکردم کەسێکی زۆر باشیت و یارمەتی خەڵکی دەدەیت. وەك دەزانیت من پیر بووم و کوڕم نیەو ئەو کچانەش بۆ شوانی ناشێن، گەر هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەیت، ئەوا یەکێ لەم کچانەی خۆمت لێ مارە دەکەم وە گەر بیکەیت بە دەساڵیش ئەوا لە چاکی و باشی خۆتە.
موسا بەم بەڵێنە ڕازی بوو، بۆ ماوەی دە ساڵ شوانی بۆ کردو یەکێ لە کچەکانی لێ مارە کرد، خێزانێکی پێك هێنا.

## *گەڕانەوەی موسا بۆ میسر :

**موسا پاش دە ساڵ لە شوانی ئیزنی وەرگرت و لەگەڵ خێزانەکەیدا بەرەو میسر بەڕێکەوتن**

لە ڕێگادا شەویان بەسەرداهات ، لە دوورەوە ڕۆشناییەکی بەدی کرد ، خێزانەکەی بە جێهێشت و بەرەو ڕوناکیەکە ڕۆیشت تاپێی گەیشت پێی، لەوێ دەنگێکی بەر گوێ کەوت .
کە خودای پەروەردگار بوو قسەی لەگەڵ دەکرد، موسا زۆر ترسا و لەرزی لێ نیشت .
خودای پەروەردگار فەرمووی: مەترسە ئەی موسا من خودای تۆم، هیچ خوایەك نیە جگە لە من.
فەرمانی پێکردو فەرمووی بڕۆ بۆلای فیرعەون و ئاگاداری بکەرەوە با واز لە ستەم و چەوساندنەوەی خەڵکی بێنێت و پێی بڵێ: ڕێگای ڕاست هەڵ بژێرێو واز لە بێدینی بێنێت.
موسا کە ئەم قسانەی بیست وتی: ئەی خودای پەروەردگار بەڵگەیەکم پێببەخشە با باوەڕم پێ بکات و هاروونی براشم لەگەڵدا بنێرە چونکە لە من قسەی ڕەوان ترە، خودای پەروەردگار فەرمووی ئەوە چیە بە دەستتەوەیە وتی: ئەوە گۆچانە مەڕەکانمی پێ بەرێوە دەبەم، فەرمووی فڕێی بدە کە فڕێیدا بوو بە مارێکی گەورە، پاشان فەرمووی دەستیشت بخە بن باڵتەوە کە دەرت هێنا یەك پارچە ڕۆشناییە.
ئیتر خودای گەورە'فەرمووی : ئەوە دوو بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایە لەگەڵ هاڕوونی براتا، بڕۆن بە نەرمی قسەی لەگەڵ بکەن، بۆ ئەوەی یا دەوەری وەربگرێت.موسا ئەو

شوێنەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت تاگەیشتە میسر، لەوێ لەگەڵ هاڕوونی برایدا ڕۆیشتن بۆ لای فیرعەون.

گفتوگۆی زۆر لە نێوانیاندا ڕوویدا لە کۆتاییدا فیرعەون وتی: بە ڕاستی ئەو شتانەی تۆ هەمووی سیحر و جادوون جا ئەی موسا شوێنو کاتێ دیاری بکە با لەگەڵ جادوو گەرەکانی خۆمدا بەرامبەر بەیەکتان بکەمەوە، موسا وتی: کاتی دیاری کراومان ڕۆژی ڕازاندنەوە بێت و لە کاتی چێشتە نگاودا خەڵکی کۆبکەوە.

## باوەڕهێنانی جادووگەران:

لەو ڕۆژەی کە دیاری کرابوو وخەڵکی لە هەموو لایەکەوە هاتنو لە شوێنی دیاری کراودا کۆبوونەوە ،

دارو دەستەی فیرعەون بەجادووگەرانیان وت: هەرچی تواناو دەسەڵات و جادوویەکتان هەیە بیخەنە کارو بەیەك پارچە و یەك دەست ، دەست بەکاربن.

بێگومان ئەوەی ئەمڕۆ دەیباتەوە سەر فرازو سەرکەوت و بەهرەمەندە، کە هەموویان ئامادەبوون جادووگەران بەموسایان گوت: ئەی موسا یان تۆ دەست پێ بکە، یان با ئێمە دەست پێبکەین.

موسا وتی: نەخێر ئێوە لە پێشدا هەموو جادووەکانی خۆتان بکەن، ئیتر هەرچی دارو و گوریسی خۆیان بوو هەڵیان داو وادەهێنرایە بەرچاو کە وەك مار دەڕوات .

موسا کە مارەکانی بینی هەستی بە ترسێك کرد لە دڵ و دەروونیدا خودای پەروەردگاریش نیگای بۆ کردو فەرمووی : مەترسە بێگومان هەر تۆ سەرکەوتوو دەبیت.

پاشان بە فەرمانی خودای گەورە گۆچانەکەی فڕێداو بوو بە مارێکی گەورە هەرچی سیحرو جادووەکانی ئەوان بوو قووتی داو هەڵی لووشی، جادووگەران کە ئەمەیان بینی زانیان جادوونیە و ڕاستە ، هەموویان سەریان خستە سەر زەوی و سوژدەیان بۆ خوابردو وتیان: ئیتر ئێمە باوەڕمان هێنا بە خودای هاروون و موسا.

فیرعەون ئەم ڕووداوەی بینی وتی: ئایا ئێوە باوەڕ دەهێنن پێش ئەوەی کە من ڕازی بم، سوێند بێت دەبێت دەست و قاچتان بە پێچەوانەوە ببڕم .

جادوو گەرەکان وتیان: بەڕاستی ئێمە باوەڕمان هێناوە و هەرگیز پەشیمان نابینەوە، تۆش چیت لە دەست دێت بیکە لێت ناترسین .

ئەگەر لە ناومان بەریت تەنها ژیانی ئەم دونیایەمان لێ دەسێنیەوە، ئەو دونیامان بەنسیب دەبێتو ناتوانی لێمان زەوت بکەیت.

## * تیاچوونی فیرعەون و دارو دەستەکەی:

پاش شکست هێنانی فیرعەون و سەرکەوتنی موسا، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ فیرعەون ئێش و ئازاری لەسەر (بنی اسرائیل) زیاتر دەکردو بە ویستی خۆی خەڵکی لێ دەکوشتن و کچەکانیانی دەکرد بە خزمەتکاری خۆی.

پاش چەند ساڵێك خودای پەروەردەگار نیگای بۆ موسا کردو فەرمووی: خۆت و هۆزەکەت پێش ئەوەی ڕۆژ ببێتەوە لە میسر دەرچن و بەجێی بهێڵن و ڕێگەی ڕوباری نیل بگرنە بەر.

موساش هۆزەکەی ئاگادارکردەوە و بەشەو هەموویان دەرچوون ، فیرعەون کە زانی (بني اسرائیل)ی لە میسر ڕۆیشتونەتە دەرەوە،

لەشکرێکی گەورەی بەڕێخستوو کەوتە دوایان ، (بنی اسرائیل) کە فیرعەون و دارو دەستەکەیان بینی زۆر ترسان چونکە ڕێیان نەبوو دەربچن لەبەر ڕووباری نیل وتیان: ئەی موسا فریامان کەوە ، گەر فیرعەون بمان گرێ هەموومان لە ناو دەبات .

موساش فەرمووی مەترسن خوامان لەگەڵە، بە فەرمانی خوا گۆچانەکەی دا لە ڕوبارەکە، یەکسەر بوو بە دووبەشی جیا و ڕێیەکی باشی تێدا پەیدابوو (بني اسرائیل) بە ڕێگەکەدا ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو بەر، فیرعەونیش وایزانی ئەو ڕێیە هەردەمێنی بۆیە دای بە ناویداو خودای پەروەردگاریش ئاوەکەی هێنایەوە یەك و هەموویان خنکان و لەناو چوون.

خودای پەروەردگار موساو باوەڕدارانی لە دەستی فیرعەون ڕزگار کردو لە دوای ئەو ژیانی خۆیان بەسەربرد.

# (ئەیوب)

( سەلامی خودای لەسەر بێت )

ئەیوب پیاوێکی ڕۆمیەو خودای پەروەردگار هەڵی بژاردو کردی بە پێغەمبەر .

ڕەوانەی کرد بۆ ئەوەی هۆزێك لە هۆزێکی جولەکە ئاگاداربکاتەوە لە ناوچەی شام لە بەینی ئەردەن و فەڵەستین دا.

ناوی تەواوی ئەیوبی کوڕی (موص)ی کوڕی (رازم)ی کوڕی (عیص)ی کوڕی (ئیسحاق)ی )ی کوڕی (ئیبراهیم)ە.

خودای پەروەردگار سەروەت و سامانێکی زۆر باشی پێ دابوو و منداڵی باشی پێ بەخشی بوو، وەك دەڵێن یەکەم دەوڵەمەندی ئەو شارە بووە.

لاشەیەکی زۆر جوان و ڕێکو پێکی هەبوو، خەڵکی حەزیان دەکرد تەماشای بکەن .

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو سەروەت و سامانەدا، ساتێك لە خودای گەورە بێ ئاگا نەدەبوو، بەڵکو خەڵکیشی ئاگادار دەکردەوە .

## * ئاگادارکردنەوەی هۆزەکەی:

هۆزی جولەکە ئەوەندە خیانەت کاربوون بەرامبەر پێغەمبەرەکانیان ، هەمیشە بە سووك سەیریان دەکردن و گاڵتەیان پێ دەکردن و بگرە زۆرێك لە پێغەمبەرانیشیان شەهید دەکرد، جاری واهەبووە چەند پێغەمبەرانیان پێکەوە شەهید دەکرد.

خودای پەروەردگاریش بە سۆزو ڕەحم و میهرەبانی خۆی، بەردەوام یەك لە دوای یەك پێغەمبەری بۆ ڕەوانە دەکردن، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی ئاخرەتدا قسەیان نەبێ، لە هەموو قەومو تیرەیەك زیاتر پێغەمبەریان بۆ هاتووە، بەڵام بە کەمی نەبێت باوەڕیان پێ نەهێناوەو وەبگرە زۆر بە شێوازێکی ناشیرین بەر پەرچیان داوەتەوە .

پێغەمبەر ئەیوبیش یەکێ بووە لەو کەسانەی کە خودای گەورە هەڵی بژاردوەو ناردوویەتی بۆ ئەوەی جولەکەی پێ ئاگادار بکاتەوە .

ئیتر چووە ناو یانەوە و ئاگاداری کردنەوە لە خواپەرستی و گوێرایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی‌و تێی گەیاندن کە دەبێت لە فەرمانی خودای گەورە دەرنەچن و بەردەوام فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن.

بەڵام هەر ماوەیەك گوێڕپەڵیان کرد، پاش ئەوە ئیتر وازیان هێناو لەسەر بێ باوەڕی خۆیان بەردەوام بوون.

ئەیوب هەرچی لەگەڵ دەکردن بێ سوود بوو گوێیان نەدەدایێ.

## * نەخۆش کەوتنی ئەیوب:

ژیان و بەسەرهاتی نەخۆشی ئەم پێغەمبەرە مەزنە ئەوەندە سەخت و بە ئێش و بە ئازارە،

ئادەمیزاد ئارام ناگرێت لە خوێندنەوەشی دا، چونکە گەر ئارام گرتن سنوورێکی هەبێ بۆ مرۆڤەکان، ئەو لەو سنوورەش تێ پەڕی کردبوو.

خودای پەروەردگار تاقی کردنەوەیەکی بەسەردا هێناو تووشی نەخۆشیەکی کرد لەو شارەدا سەردانی هەرچی پزیشکە کردی، بەڵام چارسەری نەبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نەخۆشیەکەی پەرەی دەسەندو ئازاری زیاتر دەبوو .

لەگەڵ ئەم هەموو ئازارەدا یەك لە دوای یەك منداڵەکانیشی دەمردن، تاوای لێ هات هیچ منداڵێکی نەما ، ئەو سەروەت و سامانە زۆرەشی کە هەیبوو خودای گەورە هەمووی لێ سەندەوە.

بەم شێوازە خودای پەروەردگار تاقی کردەوە، تا ماوەیەکی زۆر بەم دەردەوە دەی ناڵاند.

## * خوا پەرستی ئەیوب:

وەك چۆن باسمان کرد ئەیوب لە کاتی لەشساغی و دەوڵەمەندیدا بە هیچ شێوەیەك لە خواپەرستی بێ ئاگا نەبوو، بە هەمان شێوە لە کاتی ئەم نەخۆشیە کە بەسەری هاتبوو، بەردەوام لەسەر جێگا کەوتبوو دەیناڵاند، بەڵام بۆ ساتێکیش لە یادی خودا دانەدەبڕا .

نەخۆشیشی بە بەشێك لە خواپەرستی دەزانی، دەیزانی پاداشتی باش لەسەر وەردەگرێ، شەیتان زۆر جار دەهات بۆلای و هەموو ئەو سەروەت و سامان و لەش و لارو منداڵە جوانانەی بیر دەخستەوە، بۆ ئەوەی ناشوکری خودای گەورە بکات، بەڵام شەیتانیش لێی بێ ئومێد ببوو ، چونکە دەیزانی ئەو شتانە هەمووی خوا پێی دابوو، موڵکی ئەو بوو بۆیە دەی وت: خودای گەورە حەفتا ساڵ لەش و لاری جوان و رێك و پێکی پێ بەخشیم قەیچیەکا با چەند ساڵێکیش بە ئازارەوە لەسەر جێ بکەوم بەڕاستی ئەمە نیشانەی بەرزو پایەداری باوەڕدارە.

## * هاوسەرەکەی ئەیوب:

رۆژ لە دوای ڕۆژ ئازاری ئەیوب زیاتر دەبوو ، لەو شارەشدا خەڵکی دەریان کرد لەبەر ئەوەی دەترسان نەخۆشیەکەی بگوازێتەوە بۆیان، بۆیە لە دەرەوەی شار لە شوێنێکی چۆلدا کەپرێکیان بۆ دروست کردبوو، کەس بە دەوریدا نەدەهات .

وەك دەزانین خودای گەورە هەموو منداڵەکانیشی لێ سەندبوویەوە، بەڵام تاکە کەسێ کە بە وەفا بوو بەرامبەری و خزمەتی دەکرد هاوسەرەکەی بوو، خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەت کردنی ئەیوب و هەمیشە نانی دەکرد بەدەمیەوەو بە جوانترین شێوە بەخێوی دەکرد .

بەڵام هەرچی سەیری دەکرد، هیچ لەماڵەکەیاندا نەبوو بیخۆن ، بۆیە کە ڕۆژ دەبوویەوە بەرەو بازاری شارەکە بەڕێ دەکەوت بۆ ئەوەی کارێك ئەنجام بدات و شتێکی پێ بکرێت بۆ ماڵەوە .

چەند ڕۆژێك بەم شێوەیە لە کارکردن بەردەوام بوو، بەڵام خەڵکی کەزانیان ژنی ئەیوبە ئیتر نەیاندەگرتو ئیشیان پێ نەدەکرد، لەبەر ئەوەی دەترسان تووشی نەخۆشیەکەی ئەیوب ببن .

چەند رۆژێك دەگەڕا بە دوای کاردا بەڵام کاری دەست نەکەوت، بۆیە کە سەیری کرد هیچیان نەبوو بیخۆن، قژی خۆی بڕی و فرۆشتی، بە پارەکەی خواردنی کڕی و هێنایەوە ماڵەوە ، ئا بەم شێوازە ئەم ژنە بە ئەمەکە بەردەوام بەبێ بێزاری خزمەتی ئەیوبی دەکرد .

## * چاك بوونەوەی ئەیوب :

ئەیوب دوو برای هەبوو، ڕۆژێکیان هاتن بۆ سەردانی ، بەڵام لەبەر بۆن و بەرامەی ناخۆشی نەخۆشیەکەی نەیانتوانی لێی نزیك ببنەوە، لە دوورەوە وەستان ، یەکیان بە ئەوەی تریانی وت:خوا دەزانێت کە ئەیوب هیچ خێرو بێرێکی نیە ، بۆیە خوا بەم دەردەی بردووە.

ئەیوب بەم وتەیە زۆر پەرێشان بوو ، بە جۆرێك پێشتر بە هیچ شتێك هێندە پەرێشان نەببوو .

بۆیە ئەیوب سەری خستە سەر زەوی و پاڕایەوە لە خودای گەورەو وتی: خوایە بۆ خاتری گەورەیی خۆت سەرم بەرز ناکەمەوە هەتا چاکم نەکەیتەوە، ئەوە بوو خودای گەورە داواکەی وەرگرت .

فەرمووی ئەی ئەیوب قاچت بەزەوی بدە، ئەیوبیش کە قاچی لەزەویدا، کانیاوێك بە فەرمانی خوا هەڵقووڵا .

خودای گەورە فەرمووی: جوان خۆتی پێ بشۆو لێی بخۆرەوە، ئەیوب فەرمانەکەی خودای جێ بەجێ کرد خێرا چاك بوویەوە.

لە پاش ئەوەش خودای پەروەردگار منداڵی پێ بەخشیو سەروەت و سامانێکی باشیشی پێ بەخشی .

# (یونس)

**(سەلامی خودای لەسەر بێت)**

لە نەینەوا لە خاکی موسڵدا کە ئێستا یەکێکە لە پارێزگاکانی عێراق، کۆمەڵێ خەڵکی بێ باوەڕی دوور لە ئایینی تێدابوو، کە ژمارەیان لە سەد هەزاری زیاتر بوو بە هیچ شێوەیەك خوایان نەدەناسی بێ ئاگابوون لە خوا پەرستی .

لە هەمان کاتیشدا گەنجێکی تێدابوو بە ناوی (یونسی کوڕی مەتی) هەتا بڵێی کوڕێکی خاوەن ڕەوشت و قسە شیرین و خۆشەویست بوو لە ناو خەڵکیدا .

بۆیە خودای گەورەش هەڵیبژاردو کردی بە پێغەمبەری هۆزەکەی، ئەوەندە گەورەو بەڕێز بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ)لە وەسفیدا دەفەرموێت: (ناشێت هیچ کەسێ بڵێت لە یونسی کوڕی مەتی باشترم).

## * بانگ کردنی هۆزەکەی بۆ خوا پەرستی :

وەك باسمان کرد ئەو شارەی کە یونسی تێدا دەژیا، زیاتر لە سەد هەزار کەسی تێدابوو، تەنانەت یەك کەسی خواپەرستیشی تێدا نەبوو .

خودای پەروەردگار یونسی تێدا هەڵبژاردن و کردی بە پێغەمبەر، فەرمانی پێ کرد هۆزەکەی ئاگادار بکاتەوەو فێری خواپەرستیان بکات .

ماوەیەکی زۆر لە ناویاندا بوو، بە بەردەوامی پێ دەوتن ئەی هۆزەکەم بزانن کە خودای تاك و تەنها هەموومانی لە نەبوونەوە بەدیهێناوە، ئەو زەویەی کە لەسەری دەژین خودای پەروەردگار بۆی ڕام کردووین نیعمەتی هەمە جۆرەی خۆی ڕژاندووە بەسەرماندا .

ئاسمانەکانی بۆ فەراهەم هێناوین، هەزارەها نیعمەتی تێدایە کە سوودی لێ وەردەگرین.

بزانن گەر خودای پەروەردگار لە ئاسمانەوە بارانمان بۆ نەبارینی، هیچ کەس توانای ئەوەی نیە کە تەنها یەك دڵۆپمان بۆ ببارینی..

ئەی خەڵکینە کەی ڕەوایە ئەم خوا بە ڕەحم و بە سۆزو میهرەبانە کە هەموو شتێکی بەبێ کەم و کوڕی بۆ دابین کردوون ،

نەی پەرستن و بڕۆن داروبەرد بکەن بە خودای خۆتان و کڕنۆشی بۆ ببەن .

ئاخر چ کەسێکی خاوەن عەقڵ و بیرو هۆش ئەمە قبووڵ دەکات!؟

یونس ئەوەندە قسەی جوان و شیرینی بۆ کردن کە هەموو قسەکانی بەڵگە نەویست بوون .

چاوەڕێی ئەوە بوو بە شێوازێکی جوان وەڵامی بدەنەوە، باوەڕی پێ بهێنن.

بەڵام هەر ئەوەندە تەواو بوو لە قسەکانی، خێرا دەستیان کرد بە گاڵتەپێکردن پێی و قسە پێ وتنی و پێیان وت: باشە خوا لە تۆ باشتری دەست نەکەوت هەڵیبژێرێ و بینێرێ بۆ لامان ، باشە چۆن باوەڕت پێدەکەین کە تۆش هەر وەکو ئێمەی!؟

لە پاشاندا هەموویان پێکەوە وتیان وازمان لێ دەهێنی باشە، ئەگینا لەم شارەش وەدەرت دەنێین.

## * هەڵاتنی یونس لە هۆزەکەی:

پاش ماندووبوونێکی زۆر لە بانگەوازی لە ناو هۆزەکەیدا ، بەڵام بێ سوود بوو، تاکە کەسێ باوەڕی پێنە هێنا.

ئیتر یونس هاتەناویانەوە پێی وتن: ئەی هۆزەکەم بەڕاستی بزانن کەمن ڕەوانکراوی خودای گەورەم و بە هیچ شێوازێ درۆم بە دەمەوە نەکردووە، بەڵام مادەم ئێوە هەر لەسەر بێ باوەڕی خۆتان بەردەوامن ئەوا من بە جێتان دەهێڵم و دەڕۆم، بەڵام ئەوەش بزانن پاش سێ ڕۆژی دی خودای گەورە .

سزایەکتان بەسەر دادێنێ هەمووتان تەفرو توونا دەکات ، پاش ئەم قسەیە بەبێ ئەوەی خوا فەرمانی پێ بکات هۆزەکەی بەجێ هێشتوو ڕۆیشت.

## * باوەڕ هێنانی هۆزەکەی:

هۆزی یونس کە زانیان پەیمانی خواو پێغەمبەران هەمووی ڕاستەو دێتە جێ و بەسەر هاتی هەموو ئەو گەلانەی پێشوویان بیستبوو کە چۆن خودای گەورە سزای داون و لە ناوی بردوون .

بۆیە زۆرترسان و هەموویان چاویان ئەبلەق بوو ، بە منداڵ و ژن و پیاوو پیرو گەنجەوە ڕۆیشتنە دەرەوەی شار دەستیان کرد بە گریان و هاوار، دەستیان بەرزکردەوە و پاڕانەوە لە خودای گەورە و داوایان کرد لێیان خۆشبێ تەنانەت هەرچی ئاژەڵیشە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان ، بۆ ئەوەی خوالێیان خۆشبێت و ئەو سزایەیان لەسەر هەلگرێ ، خودای پەروەردگار بەزەیی پێیاندا هاتەوەو سزاکەی لەسەر هەلگرتن.

## * پاش هەلاتنی لە شارەکە:

یونس نەیزانی هۆزەکەی پەشیمان بوونەتەوە و باوەڕیان هێناوە ، وەك باسمان کرد بەبێ فەرمانی خودای گەورە هۆزەکەی بە جێ هێشت، بەڕێ کەوت تاگەیشتە ڕوبارێ لەوێ لەگەڵ کەشتیەك بەڕێ کەوت، بەلأم لەناو ئاوەکەدا کەشتیەکەیان لەبەر نەفەر زۆری خەریك بوو نوقمی ئاوەکە بێت.

بریاریاندا تیروپشك بکەن و یەکیان بخەنە ناو ئاوەکە .

کاتێك تیروپشکەکەیان ئەنجامدا یونس دەرچوو، بەلأم خەلکەکە لەبەر ئەوەی دەیانزانی یونس پیاوێکی زۆر باش و بە ڕەوشتە حەزیان نەکرد بیکەنە ئاوەکەوە،

بریاریاندا جارێکی تر تیروپشکی بۆ بکەن، بەلأم تا سێ جار ئەنجامیاندا .

هەر یونس دەرچوو.

یونس ناچار بوو خۆی فڕێ دایە ناو ڕووبارەکەوە .

## * یونس لە ناو ڕووبارەکەدا :

خودای پەروەردگار فەرمانی کردبوو بە نەهەنگێك یونس قووت بدا، بەلاَم بەهیچ شێوەیەك ئازاری نەدات.

ئەو وەختەی یونس خۆی خستە ڕووبارەکەوە نەهەنگەکە هاتو قووتیدا، ئا لەوێدا ئیتر یونس بیری کردەوەو زانی کە فەرمانی خودای شکاندووە، بۆیە دەستی کرد بەدوعاو پاڕانەوە ماوەیەکی زۆر لە ناو سکی نەهەنگەکەدا مایەوە، بەردەوام یادی خودای دەکردو دەپاڕایەوە لە خوا بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات.

خودای پەروەردگاریش بەدەم داواکەیەوە هات و فەرمانی کرد بە نەهەنگەکە بڕوات لە کەناری ڕووبارەکەدا دای بنێ.نەهەنگەکە چووە کە ناری ڕووبارەکەو دەمی کردەوە و یونسی فڕێ دایە دەرەوە.

لەوکاتەدا یونس بە تەواوی لاشەی ناسك و لاواز بوو خودای گەورە بەروبومێکی بۆ ڕواند لەو شوێنەدا کە زانایان دەڵێن کولەکە بووە.

لێی خوارد وردە وردە لاشەی بەهێز بوویەوە و چاك بوویەوە پاشان بەڕێ کەوت.

بەلاَم نازانین خودای گەورە ناردوویەتیەوە بۆ لای هۆزەکەی خۆی یان بۆ هۆزێکی ترو شارێکی تر ڕۆیشتووە.

# (زەکەریا)

**( سەلامی خودای لەسەر بێت )**

**خوا پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەی دەفەرمووێت:**

﴿ذِكْرُ رَحْمَةِ رَبِّكَ عَبْدَهُ زَكَرِيَّا * إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِدَاء خَفِيّاً * قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً وَلَمْ أَكُن بِدُعَائِكَ رَبِّ شَقِيّاً ﴾﴿ مريم ٢-٤﴾

**واتە: ئەی محمد (ﷺ)ئەم باسە، باسی ڕەحمەتی پەروەردگارتە، دەربارەی بەندەی خۆی زەکەریا.**

**کاتێك لە پەرستگای خۆیدا هاناو هاواری برد بۆ پەروەردگاری بە پەنهانی.**

**وتی: پەروەردگارا، بەڕاستی من ئێسکەکانم لاوازبوون و قژی سەرم هەر هەمووی سپێتی دایگرتووە، بەلاّم من هەرگیز لە دوعاو پاڕانەوەم لە زاتی تۆ نا ئومێد نەبووم و (دەستت نەناوە بە ڕوومەوە).**

**پێغەمبەر زەکەریا کێیە؟ لە کوێ ژیاوە؟ بۆ سەرج قەومێك ڕەوانە کراوە؟**

**ناوی (زەکەریای کوڕی بەرخیا ، لە پشتی پێغەمبەر سولەیمانە)**

**خودای پەروەردگار هەڵی بژاردو کردی بە پێغەمبەری (بني اسرائيل)بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە و ڕێمونیان بکات بۆ خواپەرستی .**

## * بارودۆخی ( بني اسرائيل )

**لەسەردەمی ﴿پێغەمبەر زەکەریادا جولەکەکان زۆر بایەخیان بە مزگەوت دەدا، بەشێوازێکی جوان خزمەتی مزگەوتیان دەکرد، بەلاّم زۆر بە کەمی گوێڕایەڵیان دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا لە ناو بازاڕەکان خەریکی درۆو فێڵ و تەڵەکەبازی بوون..**

ئەو زانایانەی کە خزمەتی مزگەوتیان دەکرد، پیاوێکی تێدا بوو بە ناوی (عیمران)، هاوەڵی خۆشەویستی زەکەریا بوو ، چونکە پیاوێکی زاناو داناو خواناس و خواپەرست بوو .

عیمران هاوسەرێکی نەزۆکی هەبوو منداڵی نەدەبوو ، بۆیە نزای کردوو لەخوا پاڕایەوە.

وتی: گەر خودای گەورە منداڵێکم پێ ببەخشێ ئەوا دەیکەم بە خزمەت کاری مزگەوت .

پاش ماوەیەك خودای پەروەردگار داواکەی قبووڵ کردو کچێکی پێ بەخشی ، بەڵام هەر چەندی سەیری دەکرد کچ بۆ خزمەت کاری مزگەوت ناشێ ، بۆیە وتی: هەر چەند خودای گەورە کچی پێبەخشیووم، بەڵام من هەر بەڵێنەکەی خۆم جێ بەجێ دەکەم . بۆیە ناردی بۆ مزگەوت و کردی بە خزمەتکار.

## * سەرپەرشتی مەریەم لەلایەن زەکەریاوە:

ئەو کاتەی مەریم لە دایك بوو عیمرانی باوکی مرد.

مەریەمیش لە مزگەوتدا پێویستی بە یەکێ بوو سەرپەرشتی بکات و ئاگای لێبێت .

لەبەر ئەوەی عیمران پیاوێکی باش و خۆشەویست بوو، هەموو زاناکانی جولەکە هەریەك لەلای خۆیەوە حەزی دەکرد ببێ بەسەرپەرشتیاری .

بەڵام شیاوترین کەس بۆ ئەم کارە، زەکەریا بوو چونکە مێردی پووری مەریەم بوو .

زاناکان ڕازی نەبوون زەکەریا ئەو کارە بگرێتە دەست، بڕیاریاندا تیروپشکی بۆ بکەن.

کە تیرو پشکەکەیان ئەنجامدا زەکەریا دەرچوو، بەڵام ڕازی نەبوون،

بۆ جاری دووەم و سێ یەم کردیانەوە هەر زەکەریا دەرچوو ئیتر قسەیان نەماو کارەکەیان دایە دەست .

زەکەریا ڕۆیشت حوجرەیەکی جوان و خنجیلانەی بۆ مەریەم دروست کرد و تیایدا داینا.

زەکەریا بە بەردەوامی سەردانی دەکردو خەمی دەخوارد، بەلاّم کە دەچووە سەردانی، میوەی تازەو بێ وێنەی لەلادەبینی، لەمەریەمی دەپرسی ئەم میوانەت لە کوێوە بۆ هاتووە خۆ ئەم شارە میوەی وای تێدانیە؟ مەریەمیش دەیوت لەلایەن خودای میهرەبانەوە بۆم ڕەوانە کراوە.

## * لە دایك بوونی یەحیای کوڕی :

گەورەترین نیعمەت کە خودای پەروەردگار دەی بەخشێ بە بەندەکانی نیعمەتی منداڵە، زۆرێك لە خەڵکی لەم نیعمەتە بەهرەمەندبوون و خودای گەورە پێی بەخشیوون.

بەلاّم زەکەریا تەمەنێکی زۆری بەسەر بردبوو لەو نیعمەتە بێ بەش بوو.

زۆر حەزی دەکرد خودای گەورە منداڵێکی پێ ببەخشێ لە دوای خۆی ببێ بەجێنشینی .

بۆیە دەستی کرد بە دوعاو پاڕانەوە و نوێژو خێرو چاکەکردن ،ماوەیەکی زۆر بە کزۆڵی و کلۆڵی بەردەوام داوای منداڵی لە خودای گەورە دەکرد.

خودای پەروەردگاریش نزاکەی وەرگرت و منداڵێکی پێبەخشی بە ناوی (یەحیا)و کردیشی بە پێغەمبەری هۆزەکەی .

## * مردنی زەکەریا :

لە درێژەی تەمەنیدا خەریکی پیشەی دارتاشی بوو بەرهەمی دەستی خۆی نەبایە بەرهەمی هیچ کەسێکی تری نەدەخوارد .

لە درێژەی تەمەنیدا بێ فەرمانی خودای گەورەی نەکردو ئەو پەیامەی کە پێی درابوو هەمووی گەیاند، بەلاّم لە کۆتایی ژیانیدا لە بری ئەوەی ڕێزی لێ بگرن و فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن، فەرمانیاندا لە هەر کوێ بێت لە ناوی بەرن.

ئەویش ڕای کرد بۆ ناو دارستانەکانی دەوروبەری شار بۆ ئەوەی وازی لێ بهێنن.

بەڵام وازیان لێ نەهێناو کەوتنە دوای، تا ئەوەبوو لە تاو ئەوان چووە ناو دارێکی کلۆرەوە.

پاش ماندبونێکی زۆر لە گەڕان بە دوایدا دۆزیانەوە، بەڵام نەیان هێشت بێتە دەرەوە، هەر لە ناو دارەکەدا بە مشار لەگەڵ دارەکەدا کردیان بە دوو کەرتەوەو شەهیدیان کردو گەڕایەوە بۆ خزمەتی پەروەردگاری خۆی .

# (یەحیا )

(سەلامی خودای لەسەر بێت )

پاش مردنی زەکەریا یەحیای کوڕی بوو بە جێنیشینی و خودای پەروەردگار هەڵیبژاردو کردی بە پێغەمبەری هۆزەکەی ، یەحیا چەند سیفەتێکی جوان و ناوازەی تێدا هەبوو کە بەو سیفەتانەی دڵی خەڵکی بۆلای خۆی ڕادەکێشا.

کەسێکی زۆر لەسەرخۆو نەرم و نیان بوو هەر بە نەرم و نیانی خەڵکی ئامۆژگاری دەکرد و فەرمانی پێ دەکردن بە نوێژکردن و ڕۆژوو گرتن .

خودای پەروەردگار هەر بە منداڵی زانست و زانیاری پێ بەخشی بوو، کە قسەی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد خێرا قەناعەتی پێ دەکردن.

کەسێك بوو زۆر فەقیرو هەژاری لەلا خۆشەویست بوو، بەجۆرێك کە پێی خۆش بوو هەمیشە بە هەژاری بژی.

بەردەوام سەردانی دارستان و بیابانەکانی دەکرد و بۆ ماوەیەك لەوێ بە تەنها دەمایەوە.

نانی لەگەڵ خۆی دەبرد، بەڵام کە ئاژەڵێك یان باڵدارێکی برسی بینیبایە پێیدەداو خۆی نەی دەخوارد!

بە شێوازێك وای لێ هاتبوو ببوو بە دۆست و خۆشەویستی گیاندارانیش.

هەمیشە یادی خودای دەکرد و لە فەرمانەکانی لای نەدەدا، بەردەوام خەریکی گەیاندنی پەیامی خوا بوو.

## * لە ناو هۆزەکەیدا :

یەحیا پێغەمبەرێك بوو کە زۆر پێ داگری دەکرد لەسەر چەسپاندنی حەق و ڕاستی. بەهیچ شێوازێك لێی لانەدەدا.

بەردەوام بەناو خەڵکیدا دەگەڕاو فێری پەیامەکانی خودای گەورەی دەکردن و ئاگاداری دەکردنەوە لە ڕۆژی دوایی.

هەروەها سەختی گۆڕو گۆڕەپانی مەحشەری بەبیر دەهێنانەوە، بەڵام خەڵکی هەندێ جار دەیان ویست بە زۆر شتێکی ناشیاو بە یەحیا حەڵاڵ بکەن و بڕیاریان بەکردنی ئەو شتە ناشیاوو نا پەسندە بۆ بدات.

یەکێ لەم شتە حەرام و ناپەسندانە کە دەیانویست حەڵاڵی بکەن ئەوە بوو...

هەندێ لە پاشاکانی ئەو سەردەمەی دیمەشق دەیانویست ئەو کەسانە بخوازن کە پێیان ناشێت وەك خوشکە زاو برازا...هتد.

یەحیاش بەهیچ شێوەیەك بڕیاری ئەو کارە ناشیاوەی بۆ نەدەدان.

پاشاکان کە بیستیان یەحیا ڕێگریان لێ دەکات، بۆ دەرفەتێ دەگەڕان بیکوژن و لە ناوی بەرن.

بۆ ئەو مەبەستە پیاو کوژێکیان ڕاسپاردو ناردیانە سەر یەحیا.

پیاو کوژەکەش ڕۆیشت یەحیای شەهید کردو سەری بڕی و کەللە سەرەکەی خستە سەر سینیەك و هێنای بۆیان ، پاشاکان لەبەر ئەو کارە خەڵاتێکی گەورەیان کرد.

# (عیسا)

(سەلامی خودای لەسەر بێت)

**خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەربارەی دەفەرموویێت:**

إِذْ قَالَتِ الْمَلآئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ منه اسْمُهُ الْمَسِيحُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَجِيهاً فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ [٤٥] وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ وَكَهْلاً وَمِنَ الصَّالِحِينَ [آل عمران : ٤٦]

**واتە:ئەی مەریەم بەڕاستی خوا مژدەت دەداتێ، بە وشەیەکی خۆی کە ناوی (المسیح)ە، عیسای کوڕی مەریەمە، کە پیاو ماقووڵ و پایە بەرزە لەم دونیایەدا، لە قیامەتیشدا لە دەستەی نزیکانە .**

**جا عیسا لە بێشکەداو بە گەورەیش قسە دەکات بۆ خەڵکی، لە پیاو چاکانیشە .**

**جا منداڵە خۆشەویستەکان وەرن پێکەوە گەشتێ بکەین بە ناو ژیانی پێغەمبەر عیسادا و انەو ئامۆژگاری لێوە فێربین.**

## * سەرەتای پەیدابوونی:

**مەریەمی دایکی عیسا باشترین و پاك ترین ئافرەتی ئەو سەردەمە بوو کە بەهیچ جۆرێك کارێکی ئەنجام نەدەدا کە خودای گەورە پێی ناخۆش بێت.**

**هەروەك باسمان کرد لە سەردەمی پێغەمبەر زەکەریادا خزمەتی مزگەوتی دەکردو باشترین خواپەرستی ئەنجام دەدا.**

**ڕۆژێك لە ژوورەکەی خۆیدا خەریکی خواپەرستی بوو فریشتەیەك هات بۆ لای، مەریەم کە بینی زۆر ترسا وتی: پەنا ئەگرم بە خوا، ئەگەر لەخوا دەترسی، لێم دوور بکەوە.**

**فریشتەکە وتی:من لەلایەن خواوە هاتووم وە مژدەت دەدەمێ بە منداڵێك.**

مەریەم وتی: پەنا دەگرم بە خوا، من چۆن منداڵم دەبێ کە هیچ کەس لێم نزیك نەبوتەوە.

فریشتەکە وتی: خودای گەورە بڕیاری داوەو ئەو کارە لای ئەو زۆر ئاسانە.

## * لە دایك بوونی عیسا:

ڕۆژگار تێپەڕبوو، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ مەریەم خەفەتی زیاتر دەبوو، هەرخەمی ئەوەی بوو وەڵامێکی هەبێ بۆ هۆزەکەی، وردە وردە شاری بەجێ هێشت و ڕۆیشت بۆ دەرەوەی شار لە بن دارخورمایەك لەوێ دانیشت و وتی:

خۆزگە پێش ئەم حاڵەتە بمردمایەو وەك شتێکی بێ نرخ فەرامۆش بکرامایە.

لە پاش کەمێك بە فەرمانی خودای گەورە عیسا لە دایك بوو، بەلاّم مەریەم لە ترسی هۆزەکەی نەیدەزانی چی لێ بکات.

فریشتە هات بۆلای وتی: مەترسە بڕۆ بۆ ناو هۆزەکەت و گەر پرسیاریان لێ کردی هیچ قسە مەکە و بڵێ بە ڕۆژووم، خودای پەروەردگار یارمەتیت دەدات.

## * گەڕانەوەی مەریەم بۆ ناو هۆزەکەی:

عیسا هێشتا لە باوەشی دایکی دابوو هاتە قسەو وتی: ئەی دایکە دڵتەنگ مەبە خودای گەورە کانیاوێك لە ژێر پێت هەڵ دەقوڵێنێ و دارخورماکە ڕاوەشێنە ، مەریەم بە دەستی ڕای وەشاندو خورما کەوتە خوارەوەو خواردی، لە ئاوەکەشی خواردەوە.

مەریەم بە قسەکردنی عیسای کوڕی زۆر خۆشحاڵ بوو کەمێك دڵی ئارام بوو .

ئیتر وردە وردە عیسای هەڵگرت و بەرەو ناو شار کەوتە ڕێ، هۆزەکەی کە مەریەمیان بینی منداڵێکی لە باوەشدایە ، یەکسەر کەوتنە سەرزەنشت کردنی و وتیان:

ئەی مەریەم خۆتۆ نە باوکت پیاوی خراپ بووەو نە دایکیشت کاری وا خراپی کردووە.

مەریەمیش هیچ قسەی نەکردو ئیشارەتی بۆ عیسا کرد.خەڵکەکە زۆر سەریان سوڕما وتیان:

چون ئەو منداڵە قسە دەکات، کە هێشتا شیرەخۆرە و لە باوەشی خۆتدایە.

لەو کاتەدا بە فەرمانی خوا عیسا هاتە قسەو وتی:

بەڕاستی من بەندەی خوام ، کتێبی ئینجیلی پێ بەخشیووم و کردوومی بە پێغەمبەر.

لە هەر کوێ دابم منی موبارەك و پیرۆز کردووە و ئامۆژگاری کردووم کە نوێژەکانم ئەنجام بدەم لە زەکاتدانیش درێغی نەکەم هەتا لە ژیاندا هەم.

هەروەها فەرمانی پێداوم چاك ڕەفتاربم لەگەڵ دایکم داو نەیکردووم بە کەسێکی زۆردار و بەد ڕەفتار...

سلاَوی پەروەردگارم لەسەرە، ئەو ڕۆژەی کە لە دایك بووم و ئەو ڕۆژەش کە دەمرم، ئەو ڕۆژەش زیندوو دەکرێمەوە.

خەڵکەکە کە ئەمەیان بینی وەخت بوو شێت ببن چونکە لە ژیانیاندا شتی وایان نەبینی بوو.

ئەم هەواڵە بەناو خەڵکی دا بلاَوبوویەوە و گەیشت بە پاشای ڕۆمیش، بۆیە بەزووترین کات فەرمانی دەرکرد بیکوژن.

مەریەم کە ئەم هەواڵەی بیست، خێرا عیسای هەڵگرتوو بەرەو میسر کەوتە ڕێ، بۆ ماوەی دوازدە ساڵ لەوێ مانەوە.

لە دوای ئەو دوازدە ساڵە گەڕانەوە بۆ فەڵەستین و لەوێ عیسا دەستی کرد بە بانگەواز کردن و ئاگادار کردنەوەی خەڵکی.

وردە وردە لەوێ موعجیزەکانی دەرکەوتن و خەڵکی سەرسام ببوون پێی.

بەلاَم ترسی لێ نیشتەوە لەلایەن پاشاوە، بۆیە ڕووی لە شاخ و بیابانەکان کرد لەوێ بۆ ماوەیەك ژیانی بردەسەر.

## * موعجیزەکانی عیسا :

خودای پەروەردگار چەند موعجیزەیەکی گەورەو سەر سوڕهێنەری بە عیسا بەخشی بوو، بۆ ئەوەی (بنی اسرائیل)باوەڕی پێبکەن و بەڕاستی بزانن.

لەوانە بە فەرمانی خوا مردووی زیندوو دەکردەوە و قسەی لەگەڵ دەکرد.

هەر نەخۆشێك کە چارەسەری نەبوایە لە هیچ شوێنێك دەیان هێنا بۆ لای، ئەویش چاکی دەکردەوە بە ویستی خوا ، کە دەتبینی وات دەزانی هەرگیز نەخۆش نەبووە.

لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی باوەڕیان پێنەدەهێناو داوای موعجیزەی تریان لێدە کرد، ڕۆژێك هەموویان بەرۆژو و بوون، کە ئێوارە داهات چوون بۆ لای عیسا و وتیان: ئەی عیسا لای خوا داوامان بۆ بکە با سفرەیەکمان لە ئاسمان بۆ بێنێتە خوارەوە و پڕبێ لە خواردن و خواردنەوە، بۆ ئەوەی ڕۆژووەکەمانی پێ بشکێنین.

عیسا داوای لەخوا کردو خودای پەروەردگاریش داواکەی وەرگرت و سفرەیەکی بۆ دابەزاندن هەموویان تێریان لێ خوارد.

بەلام بەشێکی کەمیان نەبێت لەگەڵی نەمانەوەو باوەڕیان پێ نەهێنا.

## * بەرزکردنەوەی عیسا بۆ ئاسمان :

هەندێ لە جولەکەکان ڕۆیشتن بۆلای پاشاو پێیان ڕاگەیاند کە عیسا لە ناو خەڵکی دا زۆر خۆشەویست بووەو خەڵکی دوای کەوتوون.

یەهوزا قوتابیەکی عیسا بوو خیانەتی لێ کردو چوو بۆ لای پاشاو وتی: ئەی پاشا گەر دەتانەوێت ئەوا من عیساتان دەدەم بە دەستەوە و شوێنەکەیتان نیشان دەدەم. پاشاش وتی:گەر تۆ ئەو کارەمان بۆ بکەیت ئەوا لەلایەن منەوە خەلاتێکی گەورە دەکرێیت.

یەهوزا چەند کەسێکی لە دارو دەستەی پاشا لەگەڵ خۆی بردوو پێی وتن: لە فلان کاتدا ئێمە دەرسمان هەیە و هەموومان لە یەك شوێندا کۆدەبینەوە، ئێوەش لەو کاتەدا وەرن منیش عیساتان پێنیشان دەدەم.

یەهوزا ڕۆیشت و دارو دەستەکەی پاشا لە کاتی دیاری کراودا خۆیان کرد بە ژووردا، خودای پەروەردگار یەهوزای خستە سەر شێوازی عیسا ، عیساشی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، کە هاتن عیسا بگرن یەهوزایان بردو هەڵیان واسی، هەر چەند هاواری کرد وتی: من عیسانیم بەلاَم وازیان لێ نەهێناو کوشتیان.

خودای پەروەردگاریش عیسای پاراست و بردی بۆ ئاسمان، هەتا ئێستاش لەوێ ماوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: پێغەمبەر عیسا لە ئاسمانە کاندایەو لەڕۆژەکانی کۆتاییدا کە دەجال دێت و فیتنەی بلاَو دەکاتەوەو دونیا پیس و بۆگەن دەکات.

خودای پەروەردگار دای دەبەزێنێتە سەر زەوی و دەجال لە ناو دەبات.

لە دوای کوشتنی دەجال چەند ساڵێ لە زەویدا دەمێنێتەوە و پاشان دەمرێت و دەگەرێتەوە بۆلای خودای گەورە.

# ﴿موحەممەد﴾

(صلى الله عليه وسلم)

خودای پەروەردگار لە قورئاندا دەربارەی دەفەرموویت:

وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ [الأنبياء : ١٠٧]

واته :

ئەی محمد (ﷺ)ئێمە تۆمان ڕەوانە نەكردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت كە ببیتە ڕەحمەت و بەرەكەت بۆ هەموو جیهانەكان (جیهانی ئادەمیزادو گیاندارو رووەك و پەری و...هیتد).

جا منداڵە چاو گەشەكان وەرن پێكەوە گەشتێك بكەین بە ناو ژیانی گەورەترین پێغەمبەر و سەروەری هەموو مرۆڤایەتی، بۆ ئەوەی شارەزابین لە بەرنامەكەی و پاشان لە ژیانی ڕۆژانەماندا جێبەجێی بكەین :

ناوی (موحەممەدی كوڕی عبداللەی كوڕی عبدالمطلب ی كوڕی هاشمی كوڕی عبدالمناف)ە

ناوی دایكیشی ﴿ئامینەی كچی وەهەب﴾ە

پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا دوومانگان بوو لە سكی دایكیدا، عبداللەی باوكی وەفاتی كرد.

بە چەند ڕۆژێ پێش لە دایكبوونی، ئەبرەهەو لەشكرەكەی بە فیلی گەورە گەورەوە ویستیان كەعبە بڕوخێنن و لە ناوی بەرن، ئەوەبوو خودای پەروەردگار پارێزگاری لە ماڵی خۆی كردوو پۆل پۆل باڵندەی ناردە سەریان و بە قوڕی سووركراوەوە دایان بە سەریاندا وەك كای خوراوی لێ كردن .

لە پاش ئەو ڕووداوە لە دووشەممەی مانگی دوازدەی ڕەبیعی یەكەم، بەرامبەر بیستی ئەپرێلی ساڵی پێنج سەدو حەفتاو یەكی زایینی، پێغەمبەری سەروەرمان لە دایك بوو.

# * گەورەبوونی :

عادەتی شاری مەکە وابوو گەر منداڵیان هەبووایە بۆ ماوەی دوو سێ ساڵان دەیان ناردە دەرەوە، بۆ ئەوەی هەوای پاکی گوندەکانی دەوروبەری شار هەڵمژن‌و بەباشی گەورەببن.

ئەو ساڵەی موحەممەد ﴿ص﴾لە دایك بوو، لەبەر ئەوەی هەتیو بوو دایەنەکان زۆر پێیان خۆش نەبوو لەگەڵ خۆیان بیبەن، بەڵام ئافرەتێك بە ناوی (حەلیمەی سەعدیە)کە زانی هیچ منداڵی بۆ نەماوەتەوە گەڕایەوە موحەممەدی هەڵگرتو بردی.

ئەو ماوەیەی کە لەگەڵیان بوو خودای گەورە نازو نیعمەتێکی ڕژاند بەسەریاندا کە بێوێنە بوو ، لەوەڕگاکانیان هەمووی سەوزبوو، گوانی مەڕو ماڵات و حوشترەکانیان پڕبوو لە شیر.

زۆر حەزیان دەکرد لەلایان بمێنێتەوە، بەڵام ڕۆژێك دوو فریشتە هاتنە لای و سنگیان لەت کرد، لە سینگیدا پارچە خوینێکی ڕەشیان دەرهێنا پاشان وەك خۆیان لێ کردەوە.

حەلیمە پاش ئەو ڕووداوە زۆر ترسا، بۆیە خێرا گێڕایەوە بۆ لای دایکی.

لە تەمەنی شەش ساڵیدا لەگەڵ دایکیدا بەسەردان ڕۆیشتن بۆ مەدینە بۆ ماڵی خاڵوانی، بەڵام لە کاتی گەڕانەوەیاندا لە بەینی مەکەو مەدینەدا ئامینەی دایکی مرد.

پاش دایکی عەبدولموتەلیبی باپیری گرتیە لای خۆی زۆر ڕێزی لێ دەگرت و بەباشی بەخێوی دەکرد.

بەڵام کە تەمەنی گەیشتە هەشت ساڵ باپیریشی مردو نەما.

پاش باپیری ئەبو تالیبی مامی بردیە لای خۆی، بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە ماڵەکەیدا مایەوە لە کوڕەکانی خۆی زیاتر ڕێزی لێ دەگرت.

لەو ماوەیە شوانی بۆ خەڵکی مەکە بە پارەیەکی کەم دەکرد، مامیشی فێری بازرگانی کردبوو، هەر جارێك بچووبایە بۆ سەفەری بازرگانی لەگەڵ خۆی دەیبرد.

## * خواستنی خەدیجە :

پاش ئەوەی شارەزاییەکی باشی پەیدا کرد، لە بازرگانیدا، لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵی دا ، لە کاروانێکی دا بازرگانی بۆ ئافرەتێك دەکرد بە ناوی خەدیجە.

لەو سەفەرەیدا خزمەتکارێکی خەدیجەی لەگەڵدا بوو کە گەڕایەوە لەلای خەدیجە سەبارەت بە دەستپاکی و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (ﷺ)شتی زۆر سەرسوڕهێنەری باسکرد.

بە جۆرێك باسی کرد خەدیجە یەکسەر موحەممەدی چووە دڵەوە.بۆیە لە ڕێی ئافرەتێکەوە موحەممەد(ﷺ)خوازبێنی لە خەدیجە کرد و کردی بە هاوسەری خۆی .

هەر چەندە موحەممەد تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو خەدیجەش چل ساڵ ، بەڵام بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ ژیانێکی پڕ خۆشیوو کامەرانیان بەسەربرد.

لە دوای هاوسەرگیری لە تەمەنی سی و هەشت ساڵی دا سەردانی ئەشکەوتی (حراء )ی دەکردو بیری لە دروست بوونی بوونەوەر دەکردەوە.

لە تەمەنی چل ساڵیدا خودای پەروەردگار لە ڕێگای جوبرەئیل لە ئەشکەوتەکەدا نیگای بۆ ناردو کردی بە پێغەمبەر (ﷺ).

## * بانگەوازکردن بۆ پەیامەکەی:

لە پاش ئەوەی کە بوو بە پێغەمبەر (ﷺ)، سەرەتا لای کەسوکارو خزمە نزیکەکانی باسی کردو پێی ڕاگەیاندن.

بۆیە یەکەم کەس کە باوەڕی پێهێنا.

لە ئافرەتاندا خەدیجەی هاوسەری .

لە منداڵاندا عەلی کوڕی ئەبو تالیبی ئامۆزای .

لە پیاواندا ئەبو بەکری سدیق.

لە کۆیلەو بەندەکاندا زەیدو بیلال.

لە پاش ئەوەی بانگەوازەکەی ئاشکرا کرد، وردە وردە خەڵکی لە هەموو لایەکەوە دەهاتن و باوەڕیان پێدەهێناو پشتگیریان لێ دەکرد.

کافرانی قورەیش بە مەیان زانی و دەستیان کرد بە ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵان.

ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئازاریان لەسەرقورس تر دەکردنو هەندێ جاریش لێیان شەهید دەکردن.

یەکێ لەو کەسانەی کە زۆر ئازاری دەدان و ڕێگری لێ دەکردن(ئەبو جەهل) بوو کە خرپترین بێ باوەڕی قورەیش بوو.

فەرمانی بەخەڵکی کرد کە سووکایەتی بە پێغەمبەر (ﷺ)و هاوەڵانی بکەن.

لەم ماوەیەدا خەدیجەی هاوسەری و ئەبو تالیبی مامی زۆر پارێزگاریان لێ دەکردو هەندێ جار نەیان دەهێشت ئازاری بدەن.بەلاّم لە دوای چەند ساڵێك هەردووکیان مردن.

قوڕەیش بە مردنی ئەم دووانە زۆر گەرم تربوون لە ئازاردانی پێغەمبەر (ﷺ) تا لە مەکەکەش دەریان کرد.

## * ڕۆیشتنی بۆ طائف:

لە پاش دەرکردنی لەمەککە، ویستی شوێنێکی تر بدۆزێتەوە و پەیامی خودای تێدا بلاو بکاتەوە .

بۆیە بەرەو طائف کەوتە ڕێ، پاش ماندووبوونێکی زۆر گەیشتە ناو شارەکە و ڕۆیشت بۆ لای گەورە پیاوانی ئەم شارە .

ئەوەی کە لە لایەن خواوە بۆی ڕەوانە کرابوو هەمووی پێی ڕاگەیاندنو بۆی ڕوون کردنەوە .

بەلام لە بری ئەوەی باوەڕی پێ بهێنن، هەر چی منداڵە وردکە هەیە کۆیان کردەوە و بەرد بارانیان کرد، تا ئەوەبوو خوێن بە قاچیدا هاتە خوارەوە .

بە دڵ شکاوی طائیفی جێهێشت و کەوتە ڕێ، لە ڕێگادا فریشتە هات بۆ لای و وتی: ئەی محمد (ﷺ)خودای پەروەردگار دەفەرموێت :گەر دەیەوێت ئەو شاخانە دەهێنینەوە بەسەر طائف داو هەموویان لەناو دەبەین.

پێغەمبەری خوا (ﷺ)فەرمووی :نا ئومێدەوارم ئەوەو منداڵی ئەوانە موسڵمان بن و ئەو ئایینە سەر بخەن.

کە گەڕایەوە بەرەو مەککە، بێ باوەڕان نەیان دەهێشت بچێتەوە ناو شاری مەککە، تا ئەوەبوو (مطعمی کوڕی عەدی) پەنای داو بردیەوە بۆ ماڵ.

## * موعجیزەی (ئیسراو میعراج ) شەو ڕەوی و بڵندبوونەوە:

ئەو رۆژی کە گەڕایەوە بۆ مەککە، لەگەڵ ئەو هەموو ناڕحەتیوو دەرکردنەدا دەپاڕایەوە لە خودای گەورەو دەیفەرموو: ((ئەی خودای پەروەردگار بەس تۆ لێم نەڕە نجێیت ئیتر من چیم بەسەر دێت ڕازیم)).

کە تاریك داهات لە نیوە شەودا خودای پەروەردگار فەرمانی بە جوبرەئیل کرد شەو ڕەوی (الاسراء المعراج) بە پێغەمبەر(ﷺ) بکات.

جوبرەئیل هات و پێغەمبەر (ﷺ)ی لەگەڵ خۆی برد بۆ مزگەوتی ئەقسا، لە وێشەوە بەرزی کردەوە بۆ ئاسمانەکان.

لە ئاسمانەکاندا هەندێك لە پێغەمبەرانی بینی و پاشان بەرز بۆوە سەر، تا ئەوە بوو بە هەشت و دۆزەخیشی بینی.

پاشان بە فەرمانی خوا بەرزکرایەوە تا گەیشتە شوێنێ ئیتر جوبرەئیل نەیتوانی بڕوا! لە دوای ئەوە ڕۆیشت تا گەیشتە خزمەتی خودای گەورە .

خودای گەورە چەند فەرمانێکی پێدا یەکێ لە وانە، فەرز کردنی نوێژبوو.

لە پاش ئەم هەموو ڕووداوە، جوبرەئیل هێنایەوە سەر زەوی و ڕۆیشتە ماڵەکەی خۆی .

کە بەیانی هەستاو چووە ناو خەڵکەوەو ئەم باسەی بۆ گێرانەوە، خەڵکی گاڵتەیان پێ دەکرد، بەڵام ئەبو بەکری سدیق فەرمووی بە ڕاستی گەر لەوە زیاتریش بڵێ من هەر بڕوای پێدەکەم.

## * کۆچ کردنی بۆ مەدینە :

پێغەمبەر (ﷺ) زانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لەلایەن بێ باوەڕانەوە ئازاری زیاتر دەدرێت، بۆیە بڕیاری دا بۆ مەدینە کۆچ بکات.

لە پێشدا هەموو هاوەڵانی خۆی ناردو پاشان خۆی و ئەبو بەکریش بە نهێنی کۆچیان کرد.

بێ باوەڕانیش هەرچی هۆکارە گرتیانە بەر بۆ ئەوەی شەهیدی بکەن، بەڵام خودای گەورە پاراستی و ڕزگاری کرد لە دەستیان .

لە پاش ئەوەی کە گەیشتە مەدینە، پێشوازیەکی بێوێنەی لێی کرا لەلایەن خەڵکەکەوە .

پاشان دەستی کرد بە دروست کردنی مزگەوت و برایەتی خستە نێوان کۆچ کەران و خەڵکی مەدینەوە .

هێشتا دووساڵ بوو لە مەدینە نیشتەجێ بوون ، قورەیش وازیان لێنە هێنان و بە لەشکرێکی سێ هەزار نەفەریەوە.

بەرەو مەدینە هاتن ، پێغەمبەر (ﷺ) بۆیان دەرچوو، لە نزیک بیرەکانی بەدردا بە یەك گەیشتن.

پاش شەرێکی گەرم و لە یەك ئاڵاندا موسوڵمانەکان بە یارمەتی خودای گەورە سەرکەوتن.

ئەم شەڕە و چەندان شەڕی تریان ئەنجامدا، تا ئەوەبوو سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێنا.

لە هەموویان گەورەتر ڕزگار کردنی مەککە بوو، کە لە دوای هەشت ساڵ لە کۆچکردن موسوڵمانان بە ویستی خوا گەڕانەوە ناو ماڵو منداڵی خۆیان .

لەو ماوەیەدا سەدان هەزار کەس باوەڕیان بەپێغەمبەر (ﷺ) هێناو شوێنی کەوتن.

نامەشی بۆ پاشاکانی سەرزەوی نارد بۆ ئەوەی موسوڵمان ببن و بگەڕێنەوە بۆ لای خودای تاك و تەنها.

پاش گەیاندنی پەیامەکەی بە تەواوی، لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی یازدەی کۆچی وەفاتی کرد، لە حوجرەکەی عائیشەدا کرد لە مەدینە ئەسپەردەیان.

موسڵمانانیش لەدوای پێغەمبەر (ﷺ)ئەبو بەکریان بە یەکەم جێنشینی خۆیان هەڵبژارد.

## مامەکانی پێغەمبەر

١ـ عەباس .

٢ـ حەمزە.

٣ـ زوبەیر.

٤ـ ئەبو تالیب .

٥ـ صفار.

٦ـ موقەوم.

٧ـ ئەبو لەهەب .

٨ـ حارث .

٩ـ حەجل.

## پوورەکانی ( خوشکی باوکی )

١ـ عاتکە.

٢ـ ئومەیمە.

٣ـ ئوم حەکیمی سپی.

٤ـ بوڕە.

٥ـ صەفیە.

٦ـ ئۆروا.

## هاوسەرەکانی

١ـ خەدیجەی کچی خوەیلید.

٢ـ سەودەی کچی زەمعە.

٣ـ عائیشەی کچی ئەبو بەکر.

٤ـ حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەتاب.

٥ـ زەینەبی کچی خوزەیمە.

٦ـ زەینەبی کچی جەحش.

٧ـ جویریەی کچی حارس.

٨ـ ئوم حەبیبە(رەملەی کچی ئەبو سوفیان) .

٩ـ صەفیەی کچی حەی کوڕی ئەختەب .

١٠ـ ئوم سەلەمی( هندی کچی ئەبو ئومەییە).

١١ـ مەیمونەی کچی حارس .

## کەنیزەکانی

١ـ ماریەی قبطی .

٢ـ ڕەیحانەی کچی زەیدی نەضیری .

## کچەکانی :

## هەموو کچەکانی لە خەدیجە بوون

١ـ زەینەب......... ئەبو عاسی کوڕی ڕەبیع خواستی .

٢ـ روقیە.......... عوسمان کوڕی عەفان خواستی.

٣ـ ئوم کەلسوم ....... عوسمانی کوڕی عەفان پاش مردنی ڕوقیە خواستی .

٤ـ فاتیمە ............ عەلی کوڕی ئەبو تالب خواستی .

## کوڕەکانی

١ـ قاسم

٢ـ عبدالله.

٣ـ ئیبراهیم .

هەموویان لەتەمەنی منداڵیدا مردوون.

سەرنج/ بۆ تەفسیری ئایەتەکان سوود لەتەفسیری ئاسان وەرگیراوە

# لە دوعای خێر بێ بەشمان مەکەن

﴿سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ • وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ • وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

[الصافات: ١٨٠- ١٨٣]

(٢٠٠٩/٥/٤)

**هەولێر**

# ناوەرۆك